پێشکێشە بە: عەلی، ئەحمەد، لارا

سیکۆ، حەسەن، ئەزیتا

مەحموود ئەحمەد عوسمان

# چراخان و شەوەزەنگ

بیرەوەری

ئیسماعیل بەرزنجی
لە عەرەبییەوە وەری گێڕاوە

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

مەحموود ئەحمەد عوسمان
چراخان و شەوەزەنگ - بیرەوەری
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: ئیسماعیل بەرزنجی
کتێبی ئاراس ژمارە: ١١٧٩
چاپی یەکەم ٢٠١١
تیرێژ: ٦٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ١٠٧٣ - ٢٠١١
نەخشاندنی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
ڕازاندنەوەی بەرگ: محەمەد کامل
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل، تریسکە ئەحمەد

مەبەست لەم کتێبە تۆمارکردنی مێژوو و نووسینەوەی بیرەوەری نییە، ئامانج تەعبیر لە دەربڕینی بیرۆکەکان و نواندنی بایەخدانی مرۆڤێکە کە نێزیکەی هەشتا ساڵە دەژی، بەڵام لە پێناو گێڕانەوەی ئەو بیرۆکانە و بایەخدانەکان لە چوارچێوە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکەیدا ناکرێت هانا بۆ مێژوو نەبەیت و پشت بە بیرەوەری نەبەستیت.

مەحموود ئەحمەد عوسمان

ماڵمان لە قەڵاتی هەولێر بوو بەرامبەر مزگەوتی گەورەی قەڵات و نێزیک گەرماوە بەناوبانگەکەی، ماڵەکەمان لە دوو باڵەخانەی تەنیشت یەکتر پێکهاتبوو کە لە نهۆمی یەکەم و ئەرزیدا، بە دوو دەرگە بەیەکتر بەسترابوونەوە، باڵەخانەی یەکەم دیوەخان بوو، هی دووەمیش تایبەت بوو بۆ خێزان و پێشوازیکردنی ژنان و خزمان، دیوەخان دوو نهۆم بوو، نهۆمی خوارەوە بریتی بوو لە هۆڵێکی گەورەی دانیشتن و ژووری نانخواردن، دیوەخان لە سەرەوەڕا داپۆشرابوو، بەڵام خانووی دانیشتن کراوە بوو کە لە حەوشی ناوەوە پێکهاتبوو و لە هەر چوارلاوە بانیژە دەوری دابوو.

لەو ماڵەدا ساڵی ١٩٣٢ هاتوومەتە دنیاوە، ساڵانی بەرایی ژیانم لەوێ بەسەربرد، خانووە بەیەکەوە بەستراوەکان و کۆڵانە تەسکەکان و دەموچاوی ڕێبواران و ژنە سەرپۆشەکانم لە بیرە، سەربانی خانووەکان شوێنی هێلانەی حاجی لەقلەق بوو، دەنگی دەف لێدانی تەکیەکەی نێزیک ماڵمان لە گوێمدا دەزرنگێتەوە، لۆبیافرۆشەکانم وەبیرە کە سپێدان لە دەرگەیان دەدا، سەردانی خزمان و مەجلیسی باوکم وەبیر دێننەوە، کە تێیدا باس لە کاروباری سیاسی و گشتی دەکرا، قەڵا غەریبەی تێدا نەبوو، دانیشتوانەکەی بە تۆڕێکی پتەو بەیەکەوە بەسترابوونەوە کە خزمایەتی و دراوسێیەتی و برادەرایەتی بەیەکەوەی کۆکردبوونەوە.

قەڵای هەولێر جیهانێک بوو داوونەریتی پتەو بەڕێوەی دەبردن، ژنان عەبا و پەچەی ڕەشیان دەپۆشی، هەندێکم وەبیر دێتەوە کە جۆرە عەبایەکیان دەپۆشی تەنیا کونێکی لە سەرەوە تێدابوو پێیان دەوت: چەرشەف پێچە، لە جیاتیی پەچەی ئاسایی کە لە قوماش دروست دەکرا دەموچاویان بە چارشێوێکی ڕەش دادەپۆشی کە لە تۆڕێکی تەلبەند دەچوو و وێنەی ماسکی دەنواند پێیان دەوت: قیرپێچە، لە جیاتیی پێڵاو جزمەیەکی زەردیان لە پێ دەکرد پێیان دەوت یەمانی، پیاوان چاکەت و پانتۆڵیان لەبەر دەکرد و بۆینباخیان دەبەست، ئەمانە زیاتر فەرمانبەر بوون،

هەندێک جلوبەرگی کوردییان دەپۆشی و چینێکیش هەبوون کەوا و سەڵتە و عەبایان دەپۆشی و شەدەیەکی ڕەشی خەت خەتیان لە سەر دەنا.

هەر ماڵێکی قەڵا هی خانەوادەیەکی ناسراو بوو، دانیشتوانی قەڵا پیاوماقووڵانی شارەکە بوون، زۆربەی بەساڵاچووەکان لە نێوان خۆیاندا بە تورکی قسەیان دەکرد کە ئەمەش پاشماوە و کاریگەری سەردەمی عوسمانی بوو، چونکە لەو کاتەدا نووسراوی فەرمیی فەرمانگەکان بە زمانی تورکی بوو، بۆ نموونە باوکم لەگەڵ هەندێک لە خزمانی هاوتەمەنی خۆی بە تورکی قسەی دەکرد، بەڵام لەگەڵ کوڕ و کچەکانی بە کوردی قسەی دەکرد، ئەمە حاڵی زۆربەی دانیشتوانی قەڵا بوو.

قەڵا دوو دەرگەی هەبوو، دەرگەی پێشەوە کە دەیڕوانیە شار و دەرگەی سەرەکی بوو، دەرگەی پشتەوەش کە پێیان دەوت "ئەحمەدیە" و بە ناوی باوکمەوە کرابوو، چونکە ئەو دروستی کردبوو باوکم کە موتەسەڕیفی هەولێر بوو لە سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق لەو دەرگەیەوە دەچوو بۆ دیوانی موتەسەڕیفیەت.

ڕۆژی هەینی لە قەڵادا چێژێکی تایبەتی هەبوو، لەو ڕۆژەدا مەلافەندیی ئامۆزای باوکم لە مزگەوتی گەورە خوتبەی دەخوێندەوە، بە ئۆتۆمۆبێلەکەی کە شوفێرێکی تورکی ناو "جەواد" دەیئاژۆت دەهاتە قەڵا، بۆ ئێمەی منداڵ ئەمە ڕووداوێکی گەورە بوو، چونکە سەیری ئۆتۆمۆبێلمان دەکرد.

مەلافەندی لە قەسرەکەی کە کەوتبووە گوندی باداوەی دەوروبەری هەولێر دادەنیشت، قەسرەکە لە دوو خانوو پێکهاتبوو، یەکێکیان بۆ خانەوادە و ئەوی تریش بۆ مێوانان، ئەو قەسرە کەوتبووە ناو ڕەزی ترێ و هەنجیر و هەنار و فستق، بەهۆی موەلیدەیەکی گەورە کە کەوتبووە دەرەوەی شوورەی قەسرەکە و دیوارێکی بەرزی هەبوو کارەبای بۆ راکێشرابوو.

قەسری باداوە، بە گۆڕەپان و هەیوان و بنمیچ و دەروازە و پەنجەرە گونجاوەکانی و هەروەها نەخشەکانی سەر دار کەلەپوورێکی بیناسازیی دەگمەن بوو، باخچەکانی بە ئەندازەیەکی ورد دیزاین کرابوون کە ڕووبەرێکی فراوانی لە نێرگز و دار و گوڵی دەگمەن بەخۆوە دەگرت. ئەو قەسرە چەندان کەسایەتیی دیاری مێوانداری کردووە، لە ژوورەکاندا گفتوگۆی گەورە کراوە و بڕیاری بۆ

وەرگیراوە، لە نێوان دیوارەکانیدا فەقێیەکان دایەلۆگیان کردووە و سیاسەتوانان قسەی خۆیان کردووە.

لە ماوەی ئینتیدابی بەریتانیادا لە عێراق و لە ماوەی دوای سەربەخۆییش، "ولاس لایۆن" پشکنەری کارگێڕی و ڕاوێژکاری سیاسیی لیوای هەولێر بوو، بە حوکمی ئەو دوو پایەیەی کە هەیبوو پێوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ مەندوبی سامی و حکوومەت لە بەغدادا هەبوو، لە کتێبی "کورد و عەرەب و بەریتانییەکان-یاداشتی ولاس لایون لە عێراق ١٩١٨-١٩٤٢" کە دەزگای توریز بۆ بڵاوکردنەوە ساڵی ٢٠٠٢ بە چاپی گەیاندووە و "دی. ک. فیلد هاوس" مامۆستای مێژوو لە زانکۆی کامبردج پێیدا چووەتەوە و پێشەکییەکی بە نرخی بۆ نووسیوە، لەو کتێبەدا لایون لە لاپەڕە (١٤١)ی باسی پێنجەمدا سەردانی مەلیک فەیسەڵی یەکەم بۆ هەولێر بەمجۆرە وەسف دەکات: دوای ئەوەی ئاسایش لە بەغدا بەرقەرار بوو مەلیک فەیسەڵی یەکەم بڕیاری دا سەردانی پایەتەختەکانی لیواکانی باکور "مووسڵ، هەولێر، کەرکووک" جگە لە سلێمانی بکات، چونکە سلێمانی ئەو کاتە ڕاستەوخۆ لەژێر ئیدارەی مەندوبی سامیدا بوو، لە ڕۆژی دیاریکراوی گەیشتنی مەلیک بۆ هەولێر لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٤ هەریەک لە ئەحمەد ئەفەندی عوسمان موتەسەڕیفی لیوای هەولێر و "چارلس لتلدیل" سەرکردەی پۆلیس و من بۆ پێشوازی چووینە سنووری لیوا، سنوورەکە لە واقیعدا بڕێتی بوو لە دەروازەیەکی ئاوی سەر زێی گەورە لە گوێڕ، موتەسەڕیف بە یارمەتیی پۆلیس توانی ڕێ رۆیشتنێک لە دانیشتوانی ناوچەکە بۆ پێشوازیی جەلالەتی مەلیک ڕێک بخات، میر زەیدی دایک برای مەلیک و گەورەفەرمانبەرانی بەڵاتی مەلیکی و هەروەها کولۆنێل کورونوالیس راوێژکاری وەزیری ناوەخۆ کە شوێنی "فیلب"ی گرتبووەوە هاوەڵی مەلیک فەیسەڵ بوون، موتەسەڕیف هاوەڵیی مەلیکی کرد و بردیە قەسری مەلافەندی لە باداوە و بووە مێوان، ڕۆژی پاشتر مەلیک فەیسەڵ و هاوەڵانی بۆ نوێژی هەینی چوونە مزگەوتی گەورەی قەلا، هەر لەو ڕووداوانەی کە قەسری باداوە بەخۆیەوە بینی هاتنی مەلیک فەیسەڵی دووەم و شاژنە عالیەی دایکی و کچە میرزادەکان بوو لە کاتی هەرای ڕەشید عالی گەیلانی ساڵی ١٩٤١، دوای گەڕانەوەی وەسی "میر عەبدولئیلا" و "نووری سەعید" خانەوادەی مەلیک باداوەیان جێ هێشت و گەڕانەوە بەغدا.

زۆر سیاسەتوان و مێژوونووس لەبارەی ئەم ڕووداوەیان نووسیوە، شازادە بەدیعەی خوشکی مەلیکە عالیە لەبارەی ئەو سەردانەوە لە یاداشتەکانیدا کە دەزگای "الحكمة" لە لەندەن ساڵی ۲۰۰۰ بە چاپی گەیاندووە لە لاپەڕە ۱۳۱دا نووسیویەتی: "لە ماڵی مەلافەندی باوکی پەرلەمانتار عیزەدین مەلا چەند ڕۆژێک ماینەوە، شەوێکیان کە نازانم بەختەوەری بوو یان شووم بوو یەکێک لە کودێتاچییەکان هات و داوای کرد مەلیک فەیسەڵی تەسلیم بکات، مەلافەندی پێی وت: "ئەگەر بمکوژن مەلیکتان تەسلیم ناکەم"، کە بینییان مەلافەندی موسیرە ناچار ڕۆیشتن، خۆمان ئامادە کرد تا بگەڕێینەوە بەغدا، لەو کاتە خەریکی تێکنانی جانتا و کەلوپەلەکانمان بووین دەنگی تەپڵ و دەف لە گوێماندا زرنگاریەوە، ئەمەش تەعبیر بوو لە خۆشیی گەڕانەوەی مەلیک بۆ بەغدا، هیچ ڕێگەیەکمان لە بەردەمدا نەما جگە لە بەشداریکردنی کوردەکان نەبێت لەو ئاهەنگەدا، دەنگی تەپڵ و دەف و زوڕنا لە هەموو شوێنێکەوە دەهات، ئێمەی ئافرەت بۆ یەکەمین جار دوای وەفاتی مەلیک غازی بەر لە دوو ساڵ جلی ڕەشمان داکەند و جلی ڕەنگاوڕەنگی چەشنی جوانی چیایەکانی کوردستانمان پۆشی و بەشداریی ئاهەنگی ئەو خەڵکە بەوەفایەمان کرد و خۆمان بۆ گەڕانەوە ئامادە کرد".

قەسری باداوە، کەلەپوورێکی بیناسازی و نیشانەیەکی دیار بوو لە ئاسۆی هەولێردا، بەتایبەتی ئەوانەی لە کەرکووکەوە بۆ هەولێر دەهاتن، بەڵام قەدەر وابوو لە سەرەتای شەستەکاندا و لە بارودۆخێکی تەمومژاویدا ئاگر لە قەسرەکە بەربدرێت کە زۆر شتی سووتاند، بەمجۆرە ئەو قەسرە جوانە بووە بیرەوەرییەکی خەمبار بۆ خانەوادە و هەموو ئەوانەی چەندان ڕۆژیان لە ژوور و باخچەکان بەسەربردووە و قەت لە بیری ناکەن. بەشێکی منداڵیم لە قەسری باداوە بەسەربردووە، باوکم ڕۆژانە سەردانی مەلافەندیی دەکرد بەتایبەتی ئەگەر لە هەولێر بووایە و لەگەڵ خۆیدا دەیبردم.

لە کۆتایی فەرمانڕەوایی عوسمانیدا، باوکم سەرۆکی شارەوانیی هەولێر بوو، دوای سەربەخۆیی عێراقیش لە ساڵی ۱۹۲۱ کرا بە یەکەم موتەسەریفی هەولێر، پاش چەند ساڵێکیش کرا بە موتەسەریفی سلێمانی، ئەو ماوەیەی کە باوکم بوو بە یەکەم موتەسەریفی هەولێر هەنگاوی یەکەم بوو بۆ بنیاتنانی بنەماکانی کارگێڕی

و حکوومەت و بەرقەرارکردنی یاسا، کەسانی عێراقی و ئینگلیز لەبارەی فەرمانڕەوایی "ئەحمەد عوسمان"یان لە هەولێردا نووسیوە، لەمانە "کرترودبیل".

مسس بیل، وەک ناسراوە دەورێکی جەوهەری لە ئاراستەکردنی ڕووداوەکان لە عێراقدا دوای دووەم شەڕی جیهانیدا بینیوە لە دەستنیشانکردنی کاراکتەرە سەرەکییەکان لە ریزبەندیی سیاسیدا بەتایبەتی دوای سەربەخۆبوونی عێراق، مسس بیل ئافرەتێکی دەگمەن بوو لە زیرەکی، ڕۆشنبیرییەکی فراوانی هەبوو و کەسایەتییەکی کاریزمی بوو، شارەزاییەکی تەواوی لەبارەی شارستانیەت و ئاڵۆزییەکانی کۆمەڵگەی عێراقیدا هەبوو، بایەخدانەکانی تەنیا بەلایەنی سیاسی نەبوو، بگرە بایەخی بە ئەدەب و ڕۆشنبیری و مێژوو و کەلەپووری عێراق دەدا، لە گەڕان بە دوای کەلەپوور و دامەزراندنی مۆزەخانەی عێراقی کۆندا ڕۆڵێکی بالای بینی، هۆڵەکەی مۆزەخانە بەناوی ئەمەوە ناودێر کرا.

لە دوای مردنی مسس بیل، کۆمەڵە نامەیەکی بلاو کرایەوە، لەو نامانەدا سەرنج و بۆچوونی خۆی لەبارەی ئەو کەسانەوە دەربڕیوە کە ڕۆڵیان لە فەرمانڕەواییکردنی عێراقدا بینیوە، هەر لە مەلیک فەیسەڵی یەکەمەوە بگرە تا دەگاتە سیاسەتوانان و سەرۆک عەشیرەتەکان و ڕۆشنبیران و ئەدیبان، لە نامەیەکدا کە مێژووی ١٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ نووسراوە بەمجۆرە وەسفی ئەحمەد عوسمان دەکات:

> "سەرلەبەیانیی ئەمڕۆمان لەگەڵ ئەحمەد فەندی موتەسەڕیفدا بەسەربرد کە کەسایەتییەکی دیاری ئەو وڵاتەیە، هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە بە دڵسۆزی کاری کردووە، ئەگەر عوسمانییەکان بگەڕێنەوە ناچارە عێراق جێ بهێڵێت، ئەحمەد عوسمان خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی فراوان و زیرەکییەکی لە ڕادەبەدەرە، کاتێ قسەی لەگەڵ دەکەم وا دەزانم یەکێکە لە ئێمە، ئەحمەدەفەندی ئامۆزای مەلافەندییە، ئەو مەلافەندییەی کە خاوەنی ورەیەکی پۆلاینە".

مایجۆر های، ڕاوێژکاری سیاسیی هەولێر، لە کتێبەکەیدا "سنتان في کوردستان" بە درێژی باسی ڕۆڵی "ئەحمەد عوسمان"ی لە داڕشتنی دامەزراوەکان لە کوردستان لە سەرەتای فەرمانڕەوایی نیشتمانیدا کردووە.

دوکتۆر عەلی وەردی، لە دوا بەشی کتێبی "ملامح من تأريخ العراق الاجتماعي"دا نووسیویەتی: لە سالانی بیستدا عەشایرەکان دەیانویست هەولێر داگیر بکەن و ئابلووقەیان دا، ئەو کاتە شارەکە هیچ پارێزگارییەکی سەربازیی تێدا نەبوو، پێش ئەوەی عەشایرەکان بگەنە شوورەی شارەکە ئەحمەد عوسمان چووە لایان، بە جورئەت و زیرەکیی خۆی وتووێژی لەگەڵدا کردن و بەڵێنی دا داواکارییەکانیان جێبەجێ بکات و رازی کردن کە بکشێنەوە، بەو کارە بوێرانە توانی شارەکە رزگار بکات و داواکارییە رەواکانی عەشایریش جێبەجێ بکات.

ئەو ماوەیەی کە ئەحمەدەفەندی موتەسەریفی سلێمانی بوو، پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفیددا هەبوو و تا وەفاتی هەر بەردەوام بوو، مێژوونووسی کورد جەمال بابان لە کتێبی "أعلام كورد العراق"دا کە سالی ٢٠٠٦ بە چاپ گەیەندراوە نووسیویەتی: "بەم دواییانە نامەکاری نێوان شێخ مەحموودی حەفید و ئەحمەد عوسمان بلاو کرایەوە، لەو نامانەدا حیکمەت و سیاسەتبینی و هەستی نیشتمانپەروەری لای ئەحمەد عوسمان بەدیار دەکەون".

رۆژنامەی ژیان، لە ژمارە ٢٥٧ی رۆژی ١٩٣٠/٨/١٤، تەواوی سەردانەکەی مەندوبی سامی بەریتانیایی و جێگری سەرۆک وەزیران "جەعفەر پاشا عەسکەری" بۆ کەرکووک و هەولێر و سلێمانی بلاو کردووەتەوە، مەبەست لەو سەردانە وەرگرتنی بیرورای سەرکردەکانی کورد بوو وەک رێگەخۆشکردنێک بۆ پەیماننامەی سالی ١٩٣٠ لە نێوان عێراق و بەریتانیا لەبەر رۆشناییی ئەو خۆپیشاندانانەی کە لە سلێمانیدا کران، مێژوونووس "حوسێن نازم" و شاعیری گەورە "پیرەمێرد" دەقی ئەو قسانەی کە لە کۆبوونەوەکاندا کراون وەک خۆیان تۆمار کردووە تا لە فەوتان رزگار بێت، رۆژنامەی- الاتحاد- لە ژمارە ٤٢٤ی رۆژی ٢٠٠١/٨/١٧ نووسینەکەی رۆژنامەی "ژیان"ی کردووە بە عەرەبی و بلاوی کردووەتەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:

"توجه نائب رئيس الوزرا و جعفر باشا العسكري والمندوب السامي البريطاني من كركوك الى اربيل يوم السبت المصادف ١٩٣٠/٨/٩ واجتمعا هناك بالاشراف ورؤسا والعشائر في الساعة العاشرة صباحاً من سراي الحكومة "مبني المتصرفية" وتلي نائب رئيس الوزرا والبيانات التي كان قد القاها في كركوك ثم نهظ المندوب السامي وتلي بياناً ايد فيه

ماورد في بيانات نائب رئيس الوزرا و وبعد ذلك نهظ احمد أفندي عثمان عظو مجلس الاعيان وقال: قبل ان اتكلم من الظروري ان يعبر رؤسا و العشائر عن افكارهم وارائهم. قال رؤسا والعشائر انهم كانوا السيد خدر احمد باشا من رؤسا و عشيرة دزەيي ليتحدث باسمهم، نهظ وقال نحن العشائر نؤيد مطالب اهل السليمانية. نحن متحدون لايمكن الفصل بين كركوك والسليمانية واربيل ثم نهظ جناب الاعيان احمد بك وقال: نحن الكورد نطالب بحقوقنا وهذا الحقوق تم اقرارها من عصبة الامم، ثم وجه كلامه الى جعفر باشا العسكري قائلاً: سيدي الباشا لقد فقدت اصبعين من اصابعك دفاعاً عن العرب ونحن نحترمك لذلك، ومن حقنا نحن ايضاً ان نفدي ارواحنا في سبيل حقوقنا الوطنية ولايحق لاحد ان يعاتبنا من الواجب ان تكون اللغة الكوردية لغة رسمية بجانب اللغة العربية في المناطق الكوردية من العراق، هذا هو قرار عصبة الامم".

مێژوونووسی عێراقی "میر بەسری" لە کتێبەکەیدا "الاعلام الكورد" بەدرێژی باسی رۆڵی "ئەحمەد عوسمان"ی لەو ماوەیەدا کردووە. ج. دی. ئەدمۆنز، راوێژکاری وەزیری ناوەخۆ و ئەندامی "چاتام هاوس" کە بە هاوبەشی لەگەڵ تۆفیق وەهبی فەرهەنگی (ئینگلیزی- کوردی)یان داناوە، لە کتێبەکەیدا "اكراد واتراك وعرب" باس لە رۆڵی ئەحمەد عوسمان لە دامەزراوەکردنی حکوومەت لە هەولێر و سلێمانیدا دەکات.

لە کۆتاییی سالانی بیست، باوکم کرا بە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران، خانەوادەکەمان ناچار بوو بچین لە بەغدا دابنیشین، سەرەتا دوو ساڵ لە عیوازییە ماینەوە و پاشان باوکم لە وەزیریە خانوویەکی دروست کرد، هاوینان دەهاتینەوە هەولێر، بە شەمەندەفەر لە وێستگەی بابولموعەزەم دەهاتینە کەرکووک و دواییش بە ئۆتۆمۆبێل دەهاتینە هەولێر، شەمەندەفەر پانتاییەکی لە ژیانی منداڵیم داگیر کردووە، ناوی ئەو وێستگانەمان دەزانی کە شەمەندەفەر تێیدا ڕادەوەستا وەک خان بەنی سەعد و خالیس و توزخورماتوو، ناوی پشکنەری تیکێت و بەرپرسی کارگوزاریمان دەزانی، دەمانزانی چ کاتێک چاودێری وێستکە شەیپور لێ دەدا، گەشتی شەمەندەفەر ڕووداوێک بوو کە چەند ڕۆژێک پێشتر خۆمان بۆ ئامادە دەکرد.



سلێمانی ساڵی ١٩٢٥، شێخ مەحموودی حەفید لە ناوەڕاست و لەلای ڕاستیشی ئەحمەد عوسمان



مەلیک غازی لە سەردانێکیدا بۆ هەولێر سەرەتای سییەکان، لەوسەری لای ڕاست ئەحمەد عوسمان، سێیەم کەس لە چەپەوە مەلافەندی، لەوسەری لای چەپ ڕەشید ئاغا



هەولێر لە سییەکاندا، دانیشتووەکان: لە ناوەڕاست جەلال بابان موتەسەڕیفی هەولێر و
لەلای راستی مەلافەندی، ئینجا رەشید ئاغا، لەلای چەپی د. سەلیم خەیات سەرۆکی
تەندروستیی هەولێر، لەوسەری لای راست سەعید قەزار بەڕێوەبەری تەحریرات لە
موتەسەڕیفیەتی هەولێر و موحسین ئاغا سەرۆکی شارەوانیی هەولێر



رەشید عالی گەیلانی ئەو کاتەی سەرۆک وەزیران بوو، سەردانی مەلافەندیی لە قەسری
باداوەدا کرد.

لەلای چەپەوە مەلافەندی، رەشید عالی گەیلانی، سێیەم کەس لە ڕاستەوە ئەمین زەکی بەگ
وەزیری ئەشغال و گەیاندن



موحسین ئاغا، سەرۆکی شارەوانیی هەولێر / لە ١٩٢٧ تا تەمووزی ١٩٥٨



ئەنجوومەنی پیاوماقوولان ۱۹۳۲

دانیشتووەکان لەلای ڕاستەوە: محەمەد ئەستربادی، عەلوان ئەلیاسری، حەسەن شەبوت، سەید محەمەد سەدر سەرۆکی ئەنجوومەنی پیاوماقوولان، محەمەد بەحر ئەلعلوم، نووری ئەلیاسری، عەدای ئەلجەریان.

ڕاوەستاوەکان لەلای ڕاستەوە: عزرا مناحیم دانیال، عەبدوڵڵا صافی، فەخری ئال جەمیل، قاسم ئاغا، یاسین ئەلخزەیری، ئەحمەد عوسمان، مەولوود موخلیس، تەها راوی



ئەحمەد عوسمان، موتەسەڕیفی لیوای هەولێر
ساڵی ١٩٢١



قەڵای هەولێر لە سییەکاندا،
سەربانی ماڵی ئەحمەد عوسمان،
لەلای چەپەوە: مەحموود ئەحمەد عوسمان، د. عەبدوڕەزاق دەباغ، فوئادی برام

ماڵەکەمان لە وەزیریە کەوتبووە سەر شەقامێک پێیان دەوت "شارع النهر"، لەو بڕوایەدام کە ئەمە ناوی فەرمی نەبوو، بەڵام دانیشتوانی وەزیریە وایان پێ دەوت، ڕووبارێکی بچووک بەویدا دەڕۆیشت کە لە بەنداوی "نازم پاشا"وە درێژ دەبووەوە تا دەگەیشتە "الکسرە"ی پاڵ "کرنتینە"، دوای ئەوەی ماڵمان چووە وەزیریە پاش ماوەیەکی کەم پێوەندیمان لەگەڵ دراوسێیەکان پەیدا کرد.

لە وەزیریەدا، دراوسێیەکان تۆڕێکی پێوەندیی پتەوی وایان دروست کرد کە دەیان ساڵی خایاند و گەیشتە نەوە دوای نەوە، ئەو پێوەندییە بە جۆرێکی ئەوتۆ درێژەی کێشا تەنانەت ئەوانەی کە چوونە دەرەوەی عێراقیش درێژەیان بەو پێوەندییە دا، "وەجیە یونس" بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس دراوسێمان بوو، هەروەها "ئەنوەر سائیب"ی بەڕێوەبەری گشتیی ئەشغال لە تەنیشت ماڵی ئێمەوە بوو، "عەبدولمەجید عەرێم" ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران لە ڕومادی و "ڕەئووف بەحرانی" کە چەند وەزارەتێکی وەرگرت لەمانە وەزارەتی دارایی، "ئیسماعیل نامیق" وەزیری بەرگری، ئەمانە هەموو دراوسێمان بوون، هەر لەسەر هەمان شەقام و نێزیک ماڵی ئێمە، ماڵی هەریەک لە "عەبدولئیلا حافز" کە دوایی بوو بە یەکەم پارێزگاری بانکی ناوەندیی عێراق و "عیزەدین نەقیب" ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران لە مەندەلی و "عەزیز یامولکی" سەرکردە لە سوپای عێراق لەوێ بوون، هەر لەو ماوەیەدا "عەلی مومتاز دەفتەری" و "عەبدولوەهاب مەحموود" و "ئەحمەد شەوقی" و "ڕەئووف ئەلکوبەیسی" و "تۆفیق وەهبی" و "یونس حەنزەل" و "سەبیح نەجیب" ماڵەکانیان لە وەزیریە بوو.

لە شەقامی "زەهاوی" نێزیک ئێمەوە، ماڵی هەندێک لە برادەرەکانی باوکم لەوێ بوو لەمانە: "لیوا عەبدولوەهاب سامەڕائی" سەرۆکی هاوەڵانی مەلیک فەیسەڵی دووەم، من و براکانم پێوەندییەکی پتەومان لەگەڵ "موزەفەر، تاریق، فاروق، موفید" و کوڕەکانی لیوا عەبدولوەهابدا هەبوو، لە سەیرکردنی یارییەکانی تۆپی پێ و پێشبڕکێکان و نواندنە وەرزشییەکاندا لە سەربانی ماڵی ئەوانەوە کە دەیڕوانییە

گۆڕەپانی کەشافە بەشداریمان دەکردن، لە یاریزانە بەناوبانگەکانی تۆپی پێ لەو کاتەدا "سالّح ئەلئەسوەد"م بیر دێتەوە، دەڵێن: دوایی بووە ئەفسەر لە سوپا یان پاسەوانی مەلیکی.

لە پێشبڕکێ وەرزشییەکاندا، زۆربەی ئەوانەی کە کاسی پاڵەوانێتییان لە یاریی گۆڕەپان و مەیدان بەدەست دەهێنا وەرزشوانانی کۆلێجی بەغدا بوون، ئەوانەی لە بیرم مابن "فوفو"ی خەڵکی بەغدا و "شاکر بەدر"ی خەڵکی بەسرە بوون، وەرزشوانانی کۆلێجی بەغدا بە فانیلەکانیان کە هەردوو پیتی (B. C)ی بەسەرەوە بوو و هەروەها لاپچینە بریقەدارەکانیان "سپایکس" دەناسرانەوە، ساڵێکیان جەماوەر تووشی سەرسڕمان بوون کاتێک یاریزانێکی قوتابخانەی کەرخ زۆربەی کاسی پاڵەوانێتییەکانی لە یارییەکانی غاردان و بەربەستدا وەدەست هێنا، بە خاڵێکی زۆرەوە بەسەر ڕکابەرەکەی "کۆلێجی بەغدا"دا سەرکەوت، جەماوەر هوتافیان بۆ دەکێشا و بە "لبلب" بانگیان دەکرد، نازانم ئەمە ناوی راستەقینەی بوو یان نا، ئەو یاریزانە لە پێشبڕکێکاندا بە پێخواسی غاری دەدا.

لە بیرەوەرییەکانی ئەو ماوەیەدا، کەسایەتیی "حەسون ئەمەریکی"م بیر دێتەوە کە بەخۆی و سەگەکەی و جلوبەرگە سەیرەکەیەوە بە شەقامەکانی سلێخ و ئەعزەمیە و تەها و وەزیریە و زەهاویدا دەسووڕایەوە و سڵاوی لە خەڵک دەکرد، یەکێکی دیکەش هەبوو ناوی "شێخان عەرەبەنچی" بوو کە دەنگێکی لێوە دەهات هەر لە لرمەی تۆپ دەچوو.

هەر لە بیرەوەرییەکانی وەزیریە، ڕێپێوانێکی سەربازە پۆلۆنییەکانم لە کاتی دووەم شەڕی جیهانیدا بە بیر دێتەوە کە هەریەکە و چرایەکیان بەدەستەوە گرتبوو و سروودی نیشتمانیی پۆلۆنیایان دەوتەوە، هەروەها ساڵی لافاوەکەی وەزیریەم لە بیرە، ئاو ناوچەی پشت بەنداوی "نازم پاشا"ی داپۆشی و خەریک بوو وەزیریە نغرۆ بێت، لە ئەنجامی ئەو لافاوەدا لە سەردابەکانی وەزیریەدا مار بڵاو بوونەوە.

ڕۆژانی هەینی، سەرلەبەیانی باوکم پێشوازیی لە مێوانان دەکرد، لەو مێوانانەی کە بەبیرم دێنەوە "عەبدولعەزیز قەساب" و "تەها راوی" و "رەئووف ئەلبەحرانی"، (رەئووف باسی نەفیکردنەکەی لەلایەن ئینگلیزەوە لەگەڵ ژمارەیەک وەزیر بۆ باشووری ئەفریقیا نەفی کرابوون بۆ باوکم دەیگێڕایەوە، دوای کۆتاییهاتنی هەرای

ڕەشید عالی گەیلانی، "عەبدولەجید عرێم" و "وەجیە یونس" و "عەبدولوەهاب سامەڕائی" و "تۆفیق وەهبی" و "یاسین خزیری"، (لە یەک خولدا لەگەڵ باوکم ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران بوو)، هەروەها "عزرا مناحم دانیال" کە نوێنەری تایفەی مووساییەکان بوو لە ئەنجوومەنی نوێنەران، یەکێکی تریش لە برادەرە نزیکەکان کە بەردەوام دەهاتە لای باوکم "عەبدوڵلا لوتفی" بوو و لە زۆر کاروباردا پرس و رایان بەیەکتر دەکرد، ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەرانی هەولێریش رۆژانی هەینی دەهاتنە لای باوکم.

یەکێک لەو مێوانانەی کە باوکم مەزەندەی نەدەکرد بچێتە لای "ئەمین حوسەینی" موفتیی فەلەستین بوو، لە هەرای ڕەشید عالی گەیلانیدا وەک پەنابەر هاتە عێراق و لە وەزیریە دانیشت، دوای ڕووخانی ڕەشید عالی گەیلانی گەڕایەوە فەلەستین.

کە چووینە بەغدا، لە قوتابخانەی مەئموونیەی سەرەتایی ناوم تۆمار کرا، ئەو کاتە قوتابخانەکە لە گۆڕەپانی مەیدان بوو، بۆ خوێندنی ناوەندیش چوومە کۆلێجی بەغدا لە سلێخ، بە پاسە زەردەکە، لە دەروازەی شەقامی زەهاوی بەلای بەلاتی مەلیکیەوە دەچووین بۆ قوتابخانە، پاسەکە لە شەقامی تەها ڕادەوەستا و قوتابیان سەردەکەوتن و ئینجا دەچووە سلێخ.

لەو ڕووداوانەی کە بەبیرم دێنەوە، رۆژێکیان لە کاتی گەڕانەوەماندا لە کۆلێجی بەغدا ژمارەیەکی زۆر لە پۆلیسمان لە کۆتاییی شەقامی تەهادا بە ئۆتۆمۆبێلی فەرمییەوە بینی، کە نزیک بووینەوە بینیمان مەلیک عەبدوڵلای یەکەم "لام وایە ئەو کاتە پێیان دەوت میر عەبدوڵلا" بە یاوەری وەسی میر عەبدولئیلا، لە ماڵی سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران "عەبدولهادی چەلەبی" دێنە دەرەوە، دیار بوو نیوەڕۆخوانێک لەسەر شەرەفی مێوانی ئوردنی ساز درابوو.

سیستەمی فێرکردنی باوکە یەسوعییەکان لە کۆلێجی بەغدا زۆر توند بوو، ئەوەی کە زیاتر توندی کردبوو باوکە کونێل بوو، کونێل و برادەرە یەسوعییەکانی بەو توندییە توانییان چەند نەوەیەک لە قوتابیی زیرەک و سەرکەوتوو دروست بکەن، پێوەندییەکی پتەو لە نێوانی باوکە یەسوعییەکان و خانەوادەی ئەو قوتابیانەی کە لە سلێخ دادەنیشتن دروست بووبوو.

کاریگەری "فەیسەڵ"ی برا گەورەم بەسەر خوشک و براکانمەوە زۆر بوو،

فەیسەڵ مرۆڤێکی بێدەنگ و گوێی لە بەرامبەرەکەی دەگرت، ڕێنوێنییەکانی هەموو کات ڕاست بوون، خانەوادەکەمان لە زۆر کاروباردا ڕاوێژیان پێ دەکرد، ئەوەی کە زیاتر بۆ ئێمە سوودگەیێن بوو فەیسەڵ فێری خوێندنەوەی کردین، بەخۆی عەشقی کتێب بوو، هەموو کات بە باوەشێک کتێبەوە دەگەڕایەوە، کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو کە ژوورێکی داگیر کردبوو بەڕێگەی فەیسەڵەوە کۆوارە میسرییەکانی وەک "الهلال" و "الرسالة"مان بینی ئەو هانی دام "العبرات"ی مەنفەلووتی و "الایام"ی تەها حوسێن و کتێبەکانی تۆفیق حەکیم و مازنی و زەیات و عەقاد و سەلامە مووسا بخوێنمەوە، فەیسەڵ تەنیا بایەخی بە ئەدەب نەدەدا، کتێبخانەکەی چەندان کتێبی مێژوویی و سیاسی و فەلسەفیی تێدابوو، لەمانە "قصة الفلسفة الحديثة"ی زەکی نەجیب مەحموود و کتێبە فەلسەفییەکانی عەبدوڕەحمان بەدەوی.

جگە لە بایەخدانی بە ئەدەبی عەرەبی، فەیسەڵ بایەخێکی زۆری بە ئەدەب و مێژووی کوردی دەدا، بەردەوام کۆواری "گەلاوێژ"ی دەخوێندەوە و لەگەڵ سەرنووسیارەکەی "عەلادین سەجادی" پێوەندیی زۆر باش بوو، هەروەها لەگەڵ ئەدیبی ناسراو ڕەفیق حیلمی و چەندان شاعیر و ئەدیبی کورد پێوەندیی زۆر باش بوو، فەیسەڵ لەگەڵ دامەزرێنەرانی حزبی هیواش کۆ دەبووەوە.

وادەزانم دوێنێیە کە فەیسەڵ کیژە گەورەی مەلافەندی کە ناوی "نەفیسە" بوو خواست، لە ماڵەکەماندا لە وەزیریە ئاهەنگی بووک گواستنەوە ساز درا، ئەو ڕۆژە خۆشترین ڕۆژ بوو لای خانەوادەکەمان، کەژاوەی بووک لە هەولێرەوە بە ژمارەیەکی زۆر ئۆتۆمۆبێل و هاوەڵی چەندان ئافرەت و بەربووک گەیشتە بەغدا، ئەو خۆشییە زۆر درێژەی نەکێشا و دوای کەمتر لە دوو ساڵ بەسەر ژنهێنانی فەیسەڵ، بە وەستانی دڵ مەلافەندی کۆچی دوایی کرد.

بەبۆنەی چلەی مەلافەندییەوە، ڕۆژنامەی "فتى العراق" ڕۆژی ١٩٤٣/٢/١١ ژمارەیەکی تایبەتی دەرکرد، لە بڕگەیەکدا هاتووە "ڕۆژی پێنجشەمم مێژووی ١٩٤٣/٢/١١ ڕۆژی ماتەمی شاری هەولێر بوو، لەو ڕۆژەدا زانای چاکەکار ئەبوبەکر مەلافەندی کۆچی دوایی کرد، خەڵک بەوپەڕی خەم و پەژارەوە هەواڵەکەیان بیست، ڕۆژی بەخاک سپاردنی تەرمەکەی لە مزگەوتی گەورەی قەڵاوە تا باداوە خەڵک ڕێچکەیان بەستبوو، ژمارەیەکی زۆر مورید لە عێراق و وڵاتانی دراوسێ ئامادە بوون".

هەر لەو رۆژنامەیەدا برووسکەی پرسەنامەی سەرۆکی تەشریفاتی مەلیکی بەناوی وەسی میر عەبدولئیلا و نووری سەعیدی سەرۆک وەزیران و محەمەد سەدری سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و سێر کورونوالیس بالْوێزی بەریتانیا لە عێراقدا بلاو کرانەوە.

چل رۆژ دوای کۆچی دوایی مەلافەندی، لە بارودۆخێکی نادیاردا "فەیسەڵ"ی برام کە لە پۆلی دووەمی کۆلێجی ماف بوو خۆی کوشت و خەمێکی قووڵی لەلای خانەوادە جێ هێشت، وەبیرم دێت ژوورەکەی فەیسەڵ بەکتێب و وێنەکانیەوە قفڵ درا، شاعیری گەورەی کورد پیرەمێرد قەسیدەیەکی لاواندنەوەی بۆ نووسی، کە فەیسەڵ کۆچی دوایی کرد، دلاوەری کوڕی تەمەنی (٨) مانگ بوو.

بەنیسبەت باوکمەوە، ئەو کارەساتە هودمەیەکی گەورە بوو کە نەیتوانی بەسەریدا زاڵ بێت، دوای (٢) ساڵ بەسەر کۆچی دوایی فەیسەڵدا چاوەکانی کز بوون و نەشتەرکاریش سوودی نەبوو کە لە قودس بۆی کرا، ساڵی ١٩٤٦ جەڵتە لێی دا و هەر بەمیش کۆچی دوایی کرد.

بۆ تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی چوومە ئامادەیی مەرکەزی، ئەو قوتابخانەیە سەرەتای جیهانێکی تازە بوو، دوای کۆلێجی بەغدا بۆ گەورەکان جیهانێک بوو، جیهانێک کە بایەخدان گرینگیی پێدا گۆڕدرا، عەلادین رەیس بەڕێوەبەر و رۆماننووس زەنون ئەیوب یاریدەر بوو، لە رۆژانی بەراییەوە پێوەندییەکی برادەرایەتیی پتەوم لە پۆلەکەمدا لەگەڵ کوڕێک پەیدا کرد ناوی سەعدون فازیل بوو، دوایی بوو بە شاعیر و دوو دیوانی بڵاو کردەوە و بایەخدانمان بە رۆشنبیری بەیەکەوەی کۆ کردبووینەوە، دوای دەوامی قوتابخانە لە بازاڕی سەرای و شەقامی موتەنەبی دەسووڕاینەوە و سەیری ناونیشانی ئەو کتێبانەمان دەکرد کە لە میسر و لبنانەوە دەهاتن، هەندێک جار دەچووینە شەقامی رەشید تا دەگەیشتینە کتێبخانەی مەکەنزی، لەوێ قسەمان لەگەڵ خاوەنی کتێبخانەکە "کەریم موراد" کە برادەری زەیدی برا گەورەم بوو دەکرد، هەندێک جار دوای کتێبخانەی مەکەنزی دەچووینە قاوەخانەی سویسری بەرامبەر سینەمای زەورا، لەوێ سەیری کۆوار و رۆژنامەمان دەکرد و قاوەمان دەخواردەوە، هەر دوای کۆتاییی دەوامی قوتابخانە گفتوگۆمان لەبارەی ئەو وتار و چیرۆک و شیعرانەوە دەکرد کە لە کۆواری "الادیب"ی لبنانیدا بڵاو دەکرانەوە، سەعدوون لە قاوەخانەدا زۆر بە سۆز و راستگۆیی شیعرەکانی دەخوێندەوە و بەیت و وشەکانی دووبارە دەکردەوە، دوای چەند ساڵێک لە بەریتانیا چاوم بە سەعدوون کەوتەوە، زانیم دەیەوێت لاسایی شاعیری گەورەی وێلز "دیلان تۆماس" دەکاتەوە بە تایبەتی لە رووی خوێندنەوە و هەندێک جاریش جۆرە فەوزایەک لە ژیان.

ئەو کاتە، بیروباوەڕی چەپڕۆی لە نێوان رۆشنبیران و قوتابیانی کۆلێج و قوتابخانەکاندا زۆر باو بوو، کتێبی چەپڕەوی رەواجی زۆر بوو و بە ئاشکرا لە کتێبخانەکاندا دەفرۆشران، کتێبخانەی (بەغدا) لە شەقامی رەشید کە خاوەنەکەی زیا و عەبدولوەهاب بوو تەنیا کتێبی چەپڕۆی دەفرۆشت و کتێبخانەکەی هەردەم تژی بوو لە کڕیار و خوێنەر.

ساڵی ١٩٤٨ راپەڕینی کانوون دژ بە ڕێککەوتننامەی پورتسموس کە لەلایەن "ساڵح جەبر"ی سەرۆک وەزیرانەوە مۆر کرا دەستی پێ کرد، خۆپیشاندانەکان لە قوتابخانە و کۆلێجەکاندا دەستیان پێ کرد، دژی ڕێککەوتننامەکە چەند هەفتەیەک بەردەوام بوون، خۆپیشاندانەکان گەیشتنە ترۆپک بەتایبەتی کاتێک پۆلیس لەسەر پردی "الشهداء" جەعفەری برا گچکەی جەواهیری شاعیریان کوشت، ئەو ڕووداوە سەرەتای هەڵگیرسانی ژیلەمۆی هەست و سۆزی خەڵک بوو، کار گەیشتە ڕادەیەک کە لە کۆنترۆڵ دەرچوو، جەواهیری بە قەسیدەیەکی ناودار جەعفەری برای لاواندەوە کە ئەوها دەست پێ دەکات:

أتعلم ام انت لاتعلم — بأن جراح الظحايا فم

من ليس كالمدعي قوله — وليس كاخر يسترحم

يصيح على المدقعين الجيا — اريقوا دمائكم تطعموا

گەورەترین خۆپیشاندان لە باخچەکانی مەلیک غازی لە "باب الشرقي" دەستی پێ کرد، هەموو حزبە سیاسییەکان بەشدارییان تێدا کرد و لە ئەنجامدا پەیماننامەی پۆرتسموس هەڵوەشایەوە.

کۆتایی هەموو مانگێک، چاوەڕێی گەیشتنی کۆواری "الكاتب المصري" کە سەرنووسەرەکەی تەها حوسێن و کۆواری- الاديب- کە لە بەیرووت دەردەچوو خاوەنەکەی ئەلبیر ئەدیب بوو؛ دەکرد، ئەوەی دواییان بەرهەمی شاعیران و ئەدیبانی عێراقیی بڵاو دەکردەوە، ژمارە نەبوو کە بەرهەمی ئەوانی تێدا نەبێت، لە کۆواری- الاديب-دا بۆ یەکەم جار شاکارەکەی "عەبدولمەلیک عەبدوللەتیف" کە بەناونیشانی "فطومة" بوو خوێندەوە، بەهەق ئەمە سەرەتای کورتە چیرۆک بوو لە عێراقدا، هەر لەو کۆوارەدا وتارەکانی نیهاد تکرلی برا گەورەی فوئاد تکرلی لەبارەی کیرکیگارد و هایدگەر و هوسرل و سارتەر خوێندەوە و هەروەها دیراسەیەکی جەبرا ئیبراهیم بەناونیشانی "الذروة في الادب والفن"م خوێندەوە کە مشتومڕێکی زۆری دروست کرد.

لەبەر هۆیەکی تریش چاوەڕوانی گەیشتنی کۆواری - الاديب-م دەکرد کە ئەمیش خوێندنەوەی وتارەکانی نووسەری میسری "یوسف شارونی" بوو، هەموو

بەرهەمــەکـانی ئەو نووســەرەم لـە وتار و کـورتە چیـرۆک دەخـوێندەوە، هەندێک لە چیرۆکەکانی لە رۆمانەکانی نەجیب مەحفووزەوە ئیلهامیان وەرگرتبوو وەک "مقتل عباس الحلو" و "زیطة" و "صانع العاهات" و "زقاق المدق"، چیرۆکەکان لە خولگەی تێ ئاوارەبوون و تەنگژەی روحی مــرۆڤـدا دەخـــولانەوە، ئەمــەیان بە روونـی لە چیرۆکی "الوباء"دا دیارە کە سالّی بلاّوبوونەوەی کولێرا لە میسر بلاّوی کردەوە، جوانترین بەرهەمی ئەو نووسەرە لای من چیرۆکی "سرقة في الطابق السادس" بوو کە باسی لە ژیانی مامۆستایەکی قوتابخانەیەکی سەرەتایی دەکرد و بە تەنیا لە نهۆمی شەشەمی باڵەخانەیەکی ئاساییدا دەژیا.

من زۆر بە یوسف شارون سەرسام بووم، دوای تێپەڕبوونی (٢٥) ساڵ، جەبرا ئیبراهیم جەبرا رۆژێکیان تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی تکایەکم هەیە، یوسف شارونی لە بەغدایە و سبەینێ بۆ فراڤین لە ماڵی خـۆم داوەتم کردووە، حەز دەکەم تۆیش ئامادە بیت، هەرگیـز ئەو فراڤـینەم بیـر ناچێتەوە، شارونی سەری سوڕما کە یەکێکی بینی هەموو نووسینەکانی ئەوی خوێندووەتەوە.

کتێبی وا هەیە کاریگەری زۆر بەسەر خوێنەرەوە جێ دەهێڵێ، بەدرێژاییی ژیانی جارجار دەوریان دەکاتەوە، ئەمیش لەبەر جوانیی دەقەکە بنەما و پێکهاتەی قووڵی کەسایەتییەکانی، (عودة الروح)ی تۆفیق ئەلحەکیم یەکێکە لەو کتێبانە، تاکە رۆمانێکی عەرەبییە کە کاریگەرییەکی قووڵی بە سەرمەوە هەیە، دوای ئەویش رۆمانەکانی نەجیب مەحفووز بە تایبەتی رۆمانی "خان الخليلي"، هەرچەندە رۆمانەکەی مەحفووز لەگەڵ هی تۆفیق ئەلحەکیم جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، بەڵام هەردووکیان تەوەرێکی هاوبەشیان هەیە، هەردووکیان چارەسەری کێشەی خۆشەویستی دەکەن، چیرۆکێکی خۆشەویستی کە بەشەرییەت بێگوناهی و جوانیی خۆی دەگێڕێتەوە.

هەر لەو کتێبانەی کە مرۆڤ لە بەردەمی خۆی دایان دەنێت و جارجاریش دەوریان دەکاتەوە رۆمانەکانی "دیستۆڤسکی"ن، وەک چۆن فرۆید لە دەروونناسیدا داهێنانی کردووە ئەوهاش دیستۆڤسکی جیهانێکی رەسم کردووە کە بەزەحمەت تیایدا خێر لە شەڕ و عەقڵ لە شێتی جیا دەکرێنەوە، وەک کەسایەتیی راسکۆلینکۆف لە رۆمانی "الجريمة والعقاب"دا، رۆمانەکەی "جۆرج دۆهامیل"یش

"اعترافات منتصف الليل" دەچێتە هەمان خانەوە و مرۆڤ ناتوانێت دەسبەرداری بێت، بەم دواییيانە هەردوو رۆمانەکەم خوێندەوە.

سالانی چلەکان و دوایيش پەنجاکان سالانی پاڵەوانێتی بوون ئەگەر ئەم دەربڕینە راست بێت، لەو سالانە شۆڕش لە بواری شیعر و وێنەکێشان و ئەدەب بەرپابوو، ئەو شۆڕشە وەک شۆڕشەکانی تر بە نهێنی لە سەردابەکاندا بەرپا نەبوو بگرە لە قاوەخانە و کتێبخانە و ڕووپەڕی رۆژنامە و کۆوارەکاندا بەرپا بوو، وەک هەموو شۆڕشەکان، شۆڕشگێڕانی ئەو بوارەش گرد بوونەوە و چالاکی و شوێنی کۆبوونەوەی خۆیان هەبوو، نزار سەلیم کۆواری "الوقت الضائع"ی بلاو کردەوە کە وێنەی بەرگی ژمارەی یەکەمی پەیکەری ئافرەتێک بوو لە دەسکردی خالید ئەلرەحال، هەروەها نزار لە نێزیک یانەی ئۆلپی لە ئەعزەمیە قاوەخانەیەکی بەناوی "واق واق" کردەوە، قاوەخانەی سویسریش لە شەقامی رەشید شوێنی سەرەکیی گردبوونەوەی رۆشنبیران بوو ئینجا لە تەنیشتی قاوەخانەی بەرازیلی و پاشانیش هۆڵەکانی پەیمانگەی هونەرە جوانەکان لە شەقامی زەهاوی نێزیک گۆڕەپانی کەشافە.

هەر لەو ماوەیەدا، بەدر شاکر سەیاب و نازک ئەلمەلائیکە و بلند حەیدەری و عەبدولوەهاب بەیاتی شیعرە نازدارەکانیان بلاو کردنەوە، بەغدايیيەکان سیحری "ئیمپریشیونیزم"و "ئێکسپیریشیونیزم"و "کوبیزم"یان دۆزییەوە و چێژیان لە تابلۆکانی جەواد سەلیم و فائیق حەسەن و شاکر حەسەن ئال سەعید و پەیکەرتاشییەکانی خالید رەحال و محەمەد غەنی حیکمەتیان بینی.

دیسان لەو ماوەیەدا، کۆمەڵەی بەغدا بۆ هونەری نوێ دامەزرا، ئەو بەیاننامە دامەزراندنەی کە جەواد سەلیم لە کۆبوونەوەکەی مۆزەخانەی جلوبەرگ لە باب ئەلشەرقی خوێندیەوە خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە بزاڤی هونەری لە عێراقدا، لە کاتی خوێندنەوەی وتارەکەیدا جەواد سەلیم هەڵوەستەیەکی کرد و بێ ئەوەی سەیری وتارە نووسراوەکەی بکات، ڕووی دەمی کردە جەماوەر و وتی: "یەکێک دێت سەیری تابلۆی – وێنەی سێوێک – دەکات و دەڵێت: "ئەمە چۆن سێوێکە، پێویستە سێو سوور و خڕ بێت، ئەمە نە سوورە و نە خڕە، ئەمە سێو نییە".

دوای تێپەڕبوونی (٢٠) ساڵ بەسەر وتارەکەی جەواد سەلیم، ئەو تێبینییەم

کاتێک بیر هاتەوە کە وتارێکی "جان کۆکتۆ"م لەبارەی پیکاسۆ پەرچڤە کرد، کۆکتۆ لە وتارەکەیدا دەڵێت: "پیکاسۆ هەموو دەم بەدوای هاووێنەدا دەگەڕا، بەشێوەیەکی وا دەیدۆزییەوە کە شێوە ئەسڵییەکەی ون دەکرد و کاتێکیش وێنەکە بەو وێنەیەی کە ئەو ڕەسمی کردبوو بەراورد دەکرا هێز و گەورەییەکەی لە دەست دەدا، زۆرجار لەو ستۆدیۆیەی کە پیکاسۆ تیایدا دیواربەندی شەڕ و ئاشتیی ڕەسم دەکرد کە دەهاتمە دەرەوە، دنیای دەرەوە بەلاوازی و شڵەژاوی دیار دەکەوت".

دیسان لەو ماوەیەدا جەبرا ئیبراهیم جەبرا سەبارەت بە سوریالیزم کۆڕێکی ساز دا و مشتومڕێکی زۆری نایەوە، هەروەها ئەوەی کە بووە وێردی سەر زاری عێراقییەکان و هەڵلایەکی گەورەی نایەوە، کۆڕێکی دوکتۆر عەلی وەردی بوو بەناونیشانی "شارستانیەت و خێڵەکیاتی لە کەسایەتیی تاکی عێراقیدا".

زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەوسا، پشتیان بەو بەرهەمە ئەدەبییانە دەبەستا کە لە زمانی ئەورووپاییەوە وەردەگێڕدران، ئەدەبی فەرەنسایی کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو بەتایبەتی بەرهەمەکانی ئەندریە جید، سارتەر، کامۆ، ئەنتوان دی سانت ئیکسوپری کە بەڕێگەی لبنان و میسرەوە دەگەیشتن.

کۆواری- الکاتب المصري- کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو، نووسەرە فەرەنساییەکان تیایاندا دەنووسی، هۆکارێکی تریش ئەو بۆچوونە بێهوودەیە بوو کە تەوژمە ئەدەبییە فەرەنساییەکانی پێ دەناسرایەوە، بەتایبەتی لە دوای دووەم شەڕی جیهانی، نووسەرە گەنجەکانی بەغدا ئەمەیان کردبووە پەناگەیەک بۆ میزاجیان، هەر لەو ماوەیەدا حوسێن مەردان دیوانی "قصائد عارية"ی بڵاو کردەوە کە بە پێوەری ئەورووپاش زۆر بوێر بوو.

دیسان هەر لەو ماوەیەدا، کۆمەڵە ئەدیب و نووسەرێکی لاوی ئینگلیزی لە بەغدادا دەژیان، زۆربەیان دەرچووی زانکۆی ئۆکسفۆرد بوون، وەزارەتی مەعاریف بۆ وتنەوەی وانەی ئەدەبی ئینگلیزی لە کۆلێجی ئاداب و خانەی بالای مامۆستایان دای مەزراندبوون لەمانە "دزموند ستیوارت، جۆن هیلۆک، ئالان نیم" ستیوارت کۆمەڵە ڕۆمانێکی بڵاو کردەوە و بە هاوبەشی لەگەڵ "جۆن هیلۆک" کتێبێکیان بە ناونیشانی (New Babylon) لەبارەی عێراقەوە بە چاپ گەیاند، تا ئەمڕۆش ئەم کتێبە سەرچاوەیەکی گرینگە سەبارەت بە ماوەی دوای دووەم شەڕی جیهانی.

ئەو ئەدیبە ئینگلیزانە، پێوەندییەکی پتەویان لەگەڵ ئەدیبان و ڕۆشنبیرانی عێراقدا دروست کرد، دزموند ستیوارت شیعری سەیاب و نازک ئەلمەلائیکە و هەڵبژاردەیەک لە هەردوو دیوانی بلّند حەیدەری "خفقة الطين- اغاني المدينة الميتة"ی وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی و لە لەندەن بە چاپی گەیاندن.

شان بەشانی هێڵی هاوتەریبی ئەدەب و هونەری شێوەکاری، لە ماوەی سالآنی چلەکان و پەنجاکاندا عێراق بزاڤێکی موزیکی گەورەی بەخۆوە بینی و شەریف محیەدین حەیدەر کە سەر بە یەکێک بوو لە ئەندامانی خانەوادەی مالیکە سەرکردایەتیی کرد و خۆیشی ڕاگری پەیمانگەی هونەرە جوانەکان بوو، پاڵپشتی لە موزیکی ڕۆهەلآتی کرد و گەورە موزیکژەنەکانی هێنا تا لە پەیمانگە وانە بڵێنەوە، لەمانە قانونژەنی ناسراوی تورک نەجدەت بارو، شەریف محیەدین حەیدەر چەلۆو عودی لێ دەدا، لەسەر دەستی ئەودا گەورە عودژەنی وەک مونیر بەشیر و سەلمان شوکر و غانم حەداد پەروەردە بوون، مقاماتی عێراقی، لەو ماوەیەدا بایەخێکی زۆری پێ درا، وەک زانراوە نووری سەعید لە ئاشقان و هاندەرانی مەقامات بووە گەورەترین کۆمەڵە مەقامی تۆمارکراو لەلای "باهیر فائیق" بوو کە دوایی بوو بە باڵوێز لە وەزارەتی دەرەوە، شێخ جەلال حەنەفیش یەکێک بوو لە شارەزایانی مەقاماتی عێراقی.

لە ئاهەنگی تاج لەسەرنانی مەلیک فەیسەڵی دووەم و ئیمزاکردنی پەیماننامەی بەغدا، ئەفسانەی گۆرانیی کلاسیکیی تورکی مونیر نوورەدین و گەورە مەقامبێژی عێراقی محەمەد گوبانچی بەشدارییان کرد.

لە چلەکاندا، تیپی سەمفۆنیای نیشتمانیی عێراقی بە سەرۆکایەتیی موزیککاری ڕۆمانی "ساندۆ ئەلبۆ" دامەزرا، ئەو تیپە چەند موزیکژەنێکی عێراقی بەخۆوە گرتبوو لەوانە "مونیر ئەڵڵا وێردی" مامۆستای کلارنێت و فوئاد ڕەزا مامۆستای فیولا، جگە لە ئاهەنگەکانی تیپی سەمفۆنیای نیشتمانی ئێوارە کۆڕی موزیک لە هۆڵەکان ساز دەدران، تیایاندا بەرهەمەکانی هایدن و موزارت و بیتهۆڤن پێشکێش دەکران، هەندێک جار لە ئەنجوومەنی ڕۆشنبیریی بەریتانیایی ئاهەنگ ساز دەدرا، خاتوو ڕوپ دانیال هاوسەری سەرۆکی ئەنجوومەنەکە ئامێری پیانۆی دەژەند.

کـۆلێـجـی پزیشکی، مـەڵبـەندێکی تری بزاڤی مـوزیکی بوو، چەندان قـوتابیی موزیکژەن و ئاشنایانی موزیکی کلاسیکیی بەخۆوە گرتبوو لەمانە غانم ئاکرەیی و یوسف ئاکرەیی برای و غانم سـەفار و خـالید قەساب و نووری مستەفا بەهجەت، ئەوانە جگە لە ڕۆڵیـان لە بـواری چالاکـیی مـوزیکی عـێـراقـیـدا لە بواری وێنەکێشانیشدا پێشـەنگ بوون و کۆمەڵەی "الرواد"یان بە سەرۆکایەتیی فائیق حەسەن دامەزراند، خالید قەساب تا ڕۆژی مردنی یەکێک بوو لە هێما دیارەکانی بزاڤی هونەری و رووناکـبـیـری لە عـێـراقـدا، جگە لەوەی نوژدارێکی دیار بوو و عەبدولکەریم قاسم دوای ئەوەی هەوڵی کوشتنی درا خالید قەسابی هەڵبژارد تا نەشتـەرکـاریی بۆ بکات، هەر لەوانەی کـە هێـمـا بوون لە بواری نوژداری و وێنەکێشان "قوتەیبە شێخ نووری" بوو.

کۆمـەڵەی ناوبراو، هەفتانە بۆ بیستنی موزیکی کلاسیکی کۆ دەبوونەوە، جگە لەوانەی ناوم بردن هەریەک لە موحسین حیکمەت سلێمان و دیکران قەسابیان و ئەمین عەبدولکەریم رەمـزی دیاری ئەو مـاوەیە بوون و پاشـان هی تریش چوونە پاڵیان، ئەو کۆمەڵە لە چەندان بۆنەی جیاجیادا لە ماڵی دوکتۆر فازل جەمالی کە دوایی بوو بە سەرۆک وەزیران کۆ دەبوونەوە، جـەمالی یەکێک بوو لە ئاشـقـانی موزیکی کلاسیکی ناودارترین نوژدارانی ساڵانی چلەکان شـەوکەوت زەهاوی و سائیب شەوکەت و هاشم ئەلوەتەری بوون، ئەوانەی یەک بەدوای یەک ڕاگرایەتیی کۆلێجی پزیشکییان کرد، بەڵام شەوکەت زەهاوی پۆستی وەزارەتی تەندروستیشی وەرگرت، لە هەشتاکان و لە بەرنـامـەی "سیرة وذكريات" کە تەلەڤزیۆنی بەغدا وەشانی دەکرد بینیمەوە، ئەو کاتە تەمەنی ٩٠ ساڵ زیاتر بوو، لە بەرنامەکەدا، پێشکێشکار لێی دەپرسێت: "دوکتۆر دەڵێن ئەو کاتەی وەزیری تەندروستی بوویت لە ساڵانی چلەکان هەڵوێستێکی نیشتمانیی گەورەت نواندووە، فەرمانی دەرکردنی سیخوڕی بەریتانیایی "سندرسن"ت دەرکردووە، کـە ڕاگری کـۆلێجی پزیشکی بووە؟".

شـەوکـەت زەهـاوی وەرامی دەداتەوە: "نەخـێـر، من دەرم نەکـرد، خـۆی دەست لەکارکێشانەوەی پێشکێش کرد، هەوڵم دا پەشیمانی بکەمەوە چونکە کارگێڕێکی باش بوو، بەڵام ئەو هەر موسیر بوو".

نازانم چۆن ئەو بڕگەیە لە چاوپێکەوتنەکە نەقرتێندرا.

سینەماکانی بەغدا لە دوای دووەم شەڕی جیهانی و کۆتاییی سالآنی پەنجاکان، وەک یانەی کۆمەلآیەتی بوون، ئەوانەی لە لۆجەکان دادەنیشتن بووبوونە ناسیاوی یەکتر، لۆجەکان لە دیواری راستەوە درێژ دەبوونەوە و تا دیواری چەپە لە دەروازەی نهۆمی سەرەوە، زۆر ئاسایی بوو لە دەوری دووەمدا کە سەعات ٩ی ئێوارە دەستی پێ دەکرد خێزانەکان یەک بەدوای یەکتر دەهاتن، هەندێک لە سینەماکان رەونەقدار و جوان بوون وەک سینەمای غازی لە باب ئەلشەرقی و سینەمای روکسی و سینەمای خەیام. یەکەم فیلم کە بینیم فیلمی "کنگ گونگ" بوو لە سینەمای رویال کە کەوتبووە کۆتاییی پردی "العتیق" و پاشان ناوی نرا پردی "الشهداء"، دووەم فیلم فیلمی "الارض الطیبة" بوو کە لە رۆمانی- بیرل باک - وەرگێڕدرا بوو، لە سینەمای رەشیددا بینیم، سێیەم فیلمیش کە بینیم فیلمی - روبن هود - بوو لە سینەمای غازی.

ئەو فیلمانەی لە بەغدا نمایش دەکران نوێترین فیلمی بەرهەمی سینەماکانی جیهان بوون وەک فیلمەکانی چارلی چاپلن "البحث عن الذهب" و "الازمنة الحدیثة" و فیلمەکانی کریتارکار بوو "الملکة کریستینا" و "غادة الکامیلیا" و فیلمەکانی والت دیزنی "ذهب مع الریح" و "فانتازیا"، فیلمی "الماخود" لە دەرهێنانی هێشتکوک و نواندنی گریگوری بک و ئەنگرید برگمان، فیلمی "الحذاء الاحمر" لە نواندنی "موارن شیرەر" و فیلمی هاملێت لە نواندنی "لورەنس ئولیفیە"، سینەما- الحمراء - فیلمی عەرەبی نمایش دەکرد وەک فیلمەکانی محەمەد عەبدولوەهاب "الوردة البیضاء، دموع الجسد، ممنوع الحب، یحیا الحب، رصاصة في القلب"، هەروەها فیلمی "غرام وانتقام"ی ئەسمەهان.

هۆلەکانی سینەما لە بەغدا بە کەشوهەوای فیلمە باشەکان و بینەرەکانیان جیهانێکی زۆر نازدار بوو، هەر بەغداییەک دەیتوانی لە باشترین شوێن چاکترین خزمەتگوزاری پێشکێش بکرێت، بەرێگەی کتێبخانەی مەکەنزی و کتێبخانەکانی تر دەیتوانی نوێترین کتێب داوا بکات و لە ماوەی هەفتەیەکدا دەکەیشتە دەستی، تۆماس کوک باشترین خزمەتگوزاریی لە دابینکردنی هوتێل و برینی بلیتی باڵەفرە و پارە گۆڕینەوە پێشکێش دەکرد، بەلآم لە پاڵ ئەو پەردە جوانەدا و لە پشت

بەنداوی نازم پاشا و لەو شوێنەی کە پێیان دەوت پایەتەخت چەندان دیمەنی قێزەونت بەرچاو دەکەوت، بەتایبەتی بارودۆخی ئەوانەی کە لە باشوورەوە هاتبوون و لەگەڵ ئاژەڵەکانیاندا لە خانووی قامیشدا ژیانیان دەبردە سەر، کە بە شەمەندەفەر دەچووینە کەرکووک بە ناوەندی ئەو خانووانەدا تێ دەپەڕین، لەبەرخۆمەوە دەموت چۆن دەبێت مرۆڤ بەم کڵۆڵییە بژی، ئاخۆ ئەمە دادپەروەرییە. بەشێوەیەکی گشتی، بەغدا لە سالانی چلەکان و پەنجاکاندا هەموو جۆرە پێوەر و سیفاتێکی شارێکی پێشکەوتووی بەخۆوە گرتبوو، بە تایبەتی لە رووی ژیان و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری و ژیاری و شارستانیەتی، مرۆڤ لە شارەکاندا رەفتاری لێبووردە و عەقڵانی بوو، دوور بوو لە سەرەرۆیی و دەمارگیری و توندوتیژی.



سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران: عەبدولوەهاب مەرجان، ئەندامانی وەزارەتەکەی بە مەلیک فەیسەڵی دووەم دەناسێنێ، عەبدولوەهاب مەرجان لەلای چەپی مەلیل ڕاوەستاوە و لەلای ڕاستیشی دوکتۆر نەدیم پاچەچی، دووەم کەس لەوسەری لای ڕاستەوە: عیزەدین مەلافەندی لەلای ڕاستیشی مەحموود بابان



بەغدا ساڵی ١٩٥١

لەلای ڕاستەوە: فوئاد رەزا سادن، شاکر حەسەن ئال سەعید، مونیر ئەڵڵا ویردی، مەحموود عوسمان، بڵند حەیدەری.

له کتێبی (جواد سليم والآخرون) تألیف شاکر حسن آل یعید



کەریم موراد، خاوەنی کتێبخانەی مەکەنزی لە بەغدا



ئەحمەد موختار بابان سەرۆک وەزیران لەلای راستییەوە عەدنان مەندەریس سەرۆک وەزیرانی تورکیا و لەلای چەپیشیەوە عیزەدین مەلافەندی جێگری یەکەمی سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران و لەسەر مەنەسەش عەبدولوەهاب مەرجان سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران لە کاتی سەردانی مێوانی تورکی بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران

لە سالآنی چلەکان و پەنجاکاندا، مانگەکانی هاوینمان لە هاوینەهەواری پیرمەم بەسەردەبرد، دوو خانوومان لە خانووەکانی گەشتوگوزاری بەکرێ دەگرت، کە هەندێک جار پێیان دەوت خانووەکانی سکەک، وەبیرم دێت دیواری یەکێک لە ژوورەکانی دانیشتن لە شووشە دروست کرابوو، لەوێوە دیمەنە سروشتییە دڵرفێنەکان جوان وەدیار دەکەوتن، بەزۆری پیاسەمان دەکرد و هەندێک جاریش لەبن کەپر دادەنیشتین و نوکتەمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، لەگەڵ دراوسێکاندا کە زۆربەیان خزم و ناسیاو بوون سەردانی یەکترمان دەکرد، بەڕاستی ڕۆژگارێکی پڕ شادی و بەختەوەری بوو.

بۆ خواردنەوەی چا و ساردەمەنی دەچووینە هوتێل سەلاحەدین و لە بانیژەکە دادەنیشتین، ڕۆژانە لە مەلەوانگەی هوتێلەکە مەلەمان دەکرد، فوئادی برا گچکەم وەرزشوان و مەلەوان بوو، لە خۆهاویشتن زۆر لێزان بوو، بە جووڵانەوەی پاڵەوانانە دەچووە سەر هەڵدەرەکە، پێش ئەوەی بکەوێتە ناو ئاوەکەوە، دانیشتوان چەپڵەیان بۆ لێ دەدا و داوایان دەکرد دووبارەی بکاتەوە.

لە پیرمەمەوە دەچووینە شەقڵاوە و گەلی عەلی بەگ و حاجی ئۆمەران و چێژمان لە دیمەنە نازدارەکانی کوردستان وەردەگرت، ئەگەر زەیدی برا گەورەمان لەگەڵ بوایە لە شەقڵاوە رادەوەستاین و دەچووینە دیوەخانی سدیق بەگی میران کە کەوتبووە سەر حەوزی ئاو و داری وای تێدا بوو کە تەمەنی لە سەدان ساڵ زیاتر بوو، دوای مردنی فەیسەڵی برا گەورەم و باوکم، زەیدی برام کاروباری خانەوادەی گرتە ئەستۆ، زەید کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو و لە خۆڕسکەوە زیرەک و بوێر بوو، دوو ڕووداو لە ژیانی زەیددا کە هێشتا گەنج بوو کەسایەتیی ئەو دەسەلمێنن، یەکەمیان کە لە سالآنی چلەکان وەزیری ناوخۆ سەردانی هەولێری کرد و لە یانەی فەرمانبەران کۆبوونەوەیەکی ساز دا و تێیدا بەرنامەی حکوومەتی بۆ لیوای هەولێر شرۆڤە کرد و لە کاتی وتار خوێندنەوەدا زەید قسەی بە وەزیر بری و وتی: "چەند داواکارییەکی گەلی کورد هەیە دەمەوێت بیدەم بە وەزیر" پۆلیس بە زەبری

هێــز لە هـۆڵەکـە بردیانـە دەرەوە و دەســتگیـریـان کـرد، دوای ئـەوە باوکم تـوانی بیـهێنێتـە دەرەوە، دووەمیـان زەید لە گرتیگە سـەردانی عـەونی یوسـفی کرد، دوای تەواوبوونی کاتـی سـەردانەکە پۆلیس داوای لێ کرد کـە بڕواتە دەرەوە، بەڵام زەید وتی: تا عەونی یوسف ئازاد نەکەن هەر لە گرتیگە دەمێنمەوە.

زەید بۆ خوێندنی یاسـا لە زانکۆی فوئاد چووە قاهیـرە، ئەو کاتە باوکم لە ژیاندا مـابوو، بەنـاوی خـوازراوەی (مـحـەمـەد شـێرزاد) کـتێـبێکی بەناونیـشـانی (نضـال الاکراد) بڵاو کردەوە، بڵاوکـردنەوەی کتێبێکـی سیاسی لەبارەی مافـەکانی کوردەوە لە نیـوەی یەکـەمی سـاڵانی چلەکـاندا بە راسـتی هەنگاوێکی بوێرانە بـوو، هـەر لە گەنجییـەوە، کێشـەی کورد زەیدی سـەرقـاڵ کردبوو، لە هـەمـان کـاتدا بە کێشـەی دیموکـراسـیـشــەوە سـەرقــاڵ بوو، لەو بڕوایـەدا بوو کـە هـەردووکـیـان بەیـەکـەوە بەسـتــراون، چەندان سـەعـات گـفـتـوگـۆی لەبارەی چەمکی دیموکـراسـیـیـەت و فراوانکردنی پێناسـەکەی کە گرێبەستی کۆمـەڵایەتی و ئازادیی بیروڕا و پاراستنی کەمینەکان بگرێتەوە، ئەمانە بەتەواوی سەرقاڵیان کردبوو.

نووســـەر و ئەدیب (زیوەر خـــەتاب) لەبارەی زەیدەوە لە رۆژنـامـــەی (خـــەبات) وتارێکی بڵاو کـردەوە و پاشـان لە کـتـێبـەکـەشـیدا (رحلة في عـالم الفكر)دا بڵاوی کردەوە و نووسـیـویەتی: (زەید ئەحـمـەد عـوسـمـان پیـاوێکی لیبـرالی و باوەڕی بە دیموکراسییەت بوو، حەزی لەوە بوو لەژێر سیستەمێکی دیموکراسیی پەرلەمانیدا بژی و تێـیـدا هاووڵاتی لـە بیـروڕادا ئازاد بێت و مـافی هـاووڵاتیـبـوونـی پارێزراو بووبێت، زەید ئارەزووی بوو ببێتـە کۆڵەگەیـەک لە کۆڵەگەکـانی ئەو سیسـتـەمـە، لە هـەمووی گرینگتریش کەسێکی زمان خاوێن و سەرزەنشتی کەسی نەدەکرد قەتیش دانەدەبەزییـە ئاسـتی ڕکابەرەکانی، جگە لە چەندان سیـفـاتی تر کـە پایەی مـرۆڤ بـەرز دەکــــەنـەوە". دوای بـڵاوبـوونـەوەی وتـارەکــــەی زیـوەر خــــەتـاب لـە رۆژی ١٩٩٨/٨/١٩ قارەمـان ئیبـراهیم نووری لە رۆژنامـەی خـەبات بەدواداچوونێکی بڵاو کردەوە و تێیدا هاتووە:

"دڵخـۆش بووم بەو وتارەی کـە بەڕێز زیوەر خـەتاب لەبارەی خـوالێخۆشـبوو زەید ئەحـمـەد عـوسـمـانەوە لە ژمـارە (٨٧٤)ی رۆژی ١٩٩٥/٥/١٥ی رۆژنـامـەی خـەباتدا بڵاوی کـردەوە، لێرەدا چـەند شـتـێک کـە لـەبارەی زەید ئەحـمـەدەوە نووسـراوە یان

باسیان کردووه باس دهکهم:

١- ئەدیب و شاعیری گەورەی عەرەب جەبرا ئیبراهیم جەبرا له لاپەڕە ٦٧ی کتێبی (شارع الامیرات - السیرة الذاتیة لجبرا ابراهیم جبرا) که له ساڵی ١٩٩٥ بەر له کۆچی دوایی به چەند مانگێک لەبارەی زەیدەوە نووسیویەتی "تا ئێستا مێژووی یەکەم سەردانی ئەمرووەدم بەتەواوی بیر دێتەوە، چونکه ڕۆژی دوایی سەرەتای بەهار بوو، ئەو ڕۆژه له بیرەوەریی مندا ئەزموونێکی قووڵه و کاری له دەروونم کرد بەتایبەتی که ئاسەواری مێژووی کۆنم له ڕووی هونەری و بیناسازییەوە بینی، هاوڕێ و ڕێنیشاندەرم لەو ناوچه جوانەی عێراقدا خوالێخۆشبوو زەید ئەحمەد عوسمان بوو، که ساڵی ١٩٥٠ به ڕێگەی مەحموودی برا گچکەیەوە ناسیم، زەید وای کرد که باکور ببینم، شارەزای هەموو سووچێک و عاشقی نیشتمانەکەی بوو، یەک له نوێنەرە لاوەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانی بوو، باوکیشی کەسایەتییەکی کوردی دیار بوو، موتەسەڕیفی هەولێر و ئەندامی ئەنجوومەنی پیاوماقووڵان بوو، هەستم کرد له ڕووی زانیاری و هاوچەرخییەوە شوێنپێی باوکی هەڵگرتووە.

٢- له کاتی لەدادگەدانی ئەحمەد موختار بابان دوا سەرۆک وەزیرانی سەردەمی مەلیکی له بەردەم دادگەی باڵای سەربازیی تایبەت که به دادگەی گەل به سەرۆکایەتیی مەهداوی ناسراوە، داواکاری گشتی له دادگەی ناوبراودا نامەیەکی به ئیمزای مەلیک فەیسەڵی دووەم خستە ڕوو که تێیدا ئاماژه بەوە دەکات که پاڵپشتی له پاڵاوتنی زەید ئەحمەد عوسمان دەکات وەک نوێنەری هەولێر، سەرۆکی دادگە ئەحمەد موختار بابان بەوە تاوانبار دەکات که ئەمە بەڵگەی دەست تێوەردان و پاڵەپەستۆ لەسەر هەڵبژاردن، وەرامی ئەحمەد موختار بابان وەک له لاپەڕە ٢٢٠ی بەشی چوارەمی لەدادگەدانەکاندا هاتووە وتوویەتی: "زەید ئەحمەد عوسمان لاوێکی دیاری هەولێرە و بێ هیچ دەست تێوەردانێک له هەڵبژاردن دەردەچێت".

هەر ماڵێک له ماڵەکانی هەولێر، ڕۆژێکی دیاریکراویان بۆ پێشوازی مێوانان تەرخان کردبوو ئەو ڕۆژه دیاریکراوە دەبووە کۆڕی بیروڕا گۆڕینەوە و باسکردنی ڕووداوەکان.

موحسین ئاغای مێردی خوشکی گەورەم کە بۆ ماوەی ٣٠ ساڵ تا تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ سەرۆکی شارەوانیی هەولێر بوو، ڕۆژانی هەینی دانی سبەینان پێشوازیی لە مێوانان دەکرد، بەڵام زەیدی برام دوای نیوەڕۆی ڕۆژێک لە هەفتەدا پێشوازیی لە مێوانەکانی دەکرد، ئەو ڕۆژانە دەبوونە کۆڕی سیاسی و فیکری و ئەدەبی.

یانەی فەرمانبەران، مەڵبەندی چالاکیی کۆمەڵایەتی بوو لە هەولێر، جگە لە پیاوە دیارەکانی شار سەرجەم فەرمانبەران ئەندامی ئەو یانەیە بوون، زۆربەی ئەندامان یاریی تاوڵی و کۆنکانیان دەکرد و پاشان لەوێ شیویان دەخوارد کە زیاتر کەبابی بەتامی هەولێر بوو.

هوتێلی سکەک، بە باخچە جوانەکانی و خزمەتگوزارییە باشەکەی شوێنێکی پەسندکراو بوو، لەوێ چێشتی ئینگلیزی لێ دەنرا، ئەو هوتێلە وەک هوتێلی سکەک لە مووسڵ و کەرکووک ساڵانێکی زۆر لە ئاستێکی بەرزدا مایەوە.

سەردانی کتێبخانەی شێخ محەمەدم دەکرد، بەڵام زۆربەی کاتم لە چاپخانە و وێنەگرییەکەی گیوی موکریانی بەسەردەبرد، گیو شاعیر و شارەزای مێژوو و ئەدەبی کوردی بوو، قسەکردن لەگەڵ ئەو زاتە زۆر چێژی تێدابوو، ڕۆژانە بۆ گوێگرتن لە قسەکانی سەردانیم دەکرد.

لەو بیرەوەرییانەی هەولێر لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکاندا کە تا ئێستاش لە بیرم ماوە دیمەنی دەروێشێک بوو، دەروێش عەلی ڕۆژی بە کۆکردنەوەی پاشماوەی خواردن لە ماڵان و چێشتخانەکاندا بەسەردەبرد و خواردنەکانی دەدا بە سەگە بەرەڵاکانی، ڕۆژانە بە دەوروبەری هەولێردا دەسووڕایەوە و دەیان سەگی بەدواوە بوو، ئەمیش وەک شوانێک چاودێریی دەکردن، کەس خۆی تێ نەدەگەیاند و بێزاری نەدەکرد.

زۆربەی خانەوادە دەسترۆیشتووەکانی هەولێر لەو ماوەیەدا هاوسۆز و لایەنگری بیروباوەڕی چەپ، تەنانەت کوڕی هەندێک لە دەرەبەگەکانیش پاڵپشتیی جووڵانەوەی جووتیارانیان دەکرد.

پێوەندیی پتەومان لەگەڵ خزمان لەلای باوکم و دایکمەوە هەبوو، دایکم کچی شێخ مارفی بەرزنجی بوو، ماڵی خاڵۆکانم لە گوندەکانی دەوروبەری هەولێر بوو،

زۆرجار سەردانمان دەکردن و چاومان بە خاڵۆزاکانمان دەکەوت، سەردانی دووگرتکانم لە بیرە کە ماڵی کورە پوورەکانم لەوێ بوون، گەورەکەیان کاک ئەحمەد پیاوێکی کۆک و زیرەک بوو، کاریزما و ئامادەگییەکی تێدابوو، گچکەکەشیان عومەر هەر لە منداڵییەوە شەیدای دەنگە خۆشەکەی بووین و سەرسامی دەکردین.

برادەرەکانی زەیدی برام، لە سلێمانی و کەرکووک و کۆیە و بەغدا دەهاتن بۆ لای، لە سلێمانی حامید بەگی جاف و جەلالی کوری و تەها محێدین مەعرووف و لە کەرکووک شێخ حوسێنی خانەقا و کاکە حەمەی برای و لە کۆیە زیاد ئاغا و مەسعوود محەمەد و لە بەغداش مستەفا قەڵەمچی و عیماد ئەرشەد عومەری دەهاتن.

ڕەوەندێکی مووسڵاویی بچووک لە هەولێر بوون کە زۆربەیان پزیشکی ناسراو بوون لە مووسڵ وەک رەشید زەکەریا و عەبدولئەحەد نوور و روفائیل تەبوونی، ئەوانە پێوەندییەکی پتەویان لەگەڵ عیزەدینی مەلافەندی و زەیدی برامدا هەبوو.

لەو ماوەیەدا، عیسمەت کەتانی بەر لەوەی لە وەزارەتی دەرەوە دابمەزرێت ساڵێک لە هەولێردا مایەوە، کەتانی برادەری زەیدی برام بوو، لەگەڵ موحسین ئاغا و یەکێک لە پزیشکە مووسڵاوییەکان یاریی (بردج)یان دەکرد، کەتانی دوایی بوو بە دیپلۆماتکارێکی دیار و پایەی باڵای لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەرگرت، نوێنەری تایبەتی ئەمینداری گشتی بوو لە سۆماڵ، هەروەها سەرۆکایەتیی کۆنگرەی ئافرەتانی جیهانی لە چیندا کرد و کاتێکیش لە ساڵی ١٩٨٢ کە عێراق سەرۆکایەتیی خولەکەی وەرگرت، کەتانی بووە سەرۆکی دەستەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، ساڵی ٢٠٠١ کۆچی دوایی کرد، ئەمینداری گشتیی ئەو کاتە (کۆفی ئەنان) بە دیپلۆماتکارێکی شارەزا وەسفی کرد و وتی: "ژیانی کەتانی بۆ هەموومان نموونەیەک بوو، کۆچی دوایی هەر بۆ کەسوکار و منداڵی زەرەر نەبوو بگرە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکانیش خەسارەت بوو"، کەتانی دوای ئەوەی لەلایەن حکوومەتەوە خانەنشین کرا، کۆفی ئەنان داوای لێ کرد وەک ڕاوێژکار بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بگەڕێتەوە، کەتانی رازی بوو، بەڵام بە مەرجێک مووچەکەی (١) یەک دۆلار بێت، دوای کۆچی دوایی؛ ئەم هەڵوێستەی وەک نووسراوێک لە بەردەم نووسینگەکەی لە نەتەوە یەکگرتووەکان هەڵواسرا.

کەتانی و زەیدی برام برادەری تەمەن بوون، ساڵی ١٩٧٨ کاتێک لە باڵەفرگەی بەغدا چاوەڕێی گەیشتنی جەنازەی زەید بووین تا لە فرنساوە بگات، کەتانیش بەوپەڕی خەمەوە لەگەڵ ئێمە راوەستابوو، بۆی هەیە ساڵانی پەنجاکانی لە هەولێر وەبیر هاتبێتەوە پێش ئەوەی بچێتە وەزارەتی دەرەوە، یان ئەو گفتوگۆیانەی هاتبێتەوە بیر کە لەگەڵ زەیددا لەبارەی دیموکراسییەت و ئازادی و عێراقی پاشەڕۆژەوە دەیانکرد.

لە سەیروسەمەرەکانی قەدەریش، لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە نێوان ساڵانی ١٩٧٠-١٩٧٣دا کە پاش تێپەڕبوونی ماوەی یاسایی بڵاو کرانەوە، لەوێدا رۆڵی کەتانی و زەید لە کێشەی کورد دیار خراوە، ئەمەش دوو برووسکەی ئاڵوگۆڕکراوی نێوان باڵوێزی ئەوسای ئەمەریکا (جۆرج بوش)ی باوک و (هینری کیسنجەر)ی وەزیری دەرەوەیە.

باڵوێزی ئەمەریکا - نەتەوە یەکگرتووەکان

بۆ وەزارەتی دەرەوە - واشنتۆن

مێژووی: ١٩٧٢/٣/٢٨

عیسمەت کەتانی یاریدەری ئەمینداری گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان پێوەندیی پێوە کردم و وتی: کەوا مستەفا بارزانی سەرکردەی کوردانی عێراق نامەیەکی بۆ حکوومەتی ئەمەریکا هەیە و زەید ئەحمەد عوسمان برادەر و راوێژکاری بارزانی دەیگەیەنێت و دەیەوێت چاوی بە وەزیر کیسنجەر و من بکەوێت، کەتانی وتی: ئەو پێوەندییەکان ئەنجام دەدات نەک لەبەرئەوەی لێپرسراوێکی نەتەوە یەکگرتووەکانە، بگرە لەبەرئەوەی کوردە و پێوەندیی کەسێتیی لەگەڵ زۆربەی سەرانی کورددا هەیە، کەتانی داوای لێ کردم ئەو پێوەندییانە بە نهێنی بمێنێتەوە.

لێدوان:

کەتانی لە نەتەوە یەکگرتووەکان خۆشەویست و ناسراوە، بێگومان دەتوانێت راستگۆییی زەید ئەحمەد عوسمانی نوێنەری بارزانی

بسەلمێنێت، ئێمە لێرەوە و بە گوێرەی ڕێنوێنییەکانی وەزارەتی دەرەوە جارجار پێوەندی بە کەتانییەوە دەکەین تا بزانین رای لەبارەی کێشەی کوردەوە چییە.

تکایە وەرامم بدەنەوە ئەگەر نارازین چاوم بە نێردراوی بارزانی بکەوێت...

لە وەزارەتی دەرەوە

بۆ باڵوێزی ئەمەریکا- نەتەوە یەکگرتووەکان

مێژووی: ١٩٧٢/٣/٢٩

ئەمە دووپاتکردنەوەی پێوەندیی تەلەفۆنی ئەمڕۆیە لەبارەی چاوپێکەوتنی باڵوێز بوش لەگەڵ زەید ئەحمەد عوسمان نێردراوی سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی.

وەزارەتی دەرەوە لاریی نییە، دووبارەی دەکەمەوە لاری لەوەدا نییە باڵوێز بوش چاوی بە نوێنەری سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی بکەوێت، ئێمە لە واشنتۆن هەمان سیاسەت جێبەجێ دەکەین، دەشبێت دووپاتی سیاسەتی درێژخایەن بکەینەوە، ئەمەش ئامادەگیمانە بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ سەرانی کورد بەشێوەیەکی نافەرمی تا گوێیان لێ بگرین و بزانین چ دەڵێن.

ئەیلوولی ساڵی ١٩٥١ بۆ خوێندن چوومە بەریتانیا، چەند هەفتەیەک لە شەقامی "گلۆستەر" لە لەندەن نێزیک باڵوێزخانەی عێراق لە "کوینس گەیت"دا مامەوە بەر لەوەی بچمە کۆلێجی "گیلد فۆرد" لە هەرێمی "سری" لە شاری گیلد فۆرد نێزیک لەندەن.

ساڵی ١٩٥١، ئاسەواری دووەم شەڕی جیهانی بەسەر هەموو شوێنێکی لەندەنەوە دیاربوو، ئەو باڵەخانانەی کە دەوری کاتدرائیەی "سانت بولی"یان دابوو هەمووی دار و پەردوو بوو، کاریگەری شەڕ بەسەر ژیانی رۆژانەی خەڵکەوە دیاربوو، هەر تاکێک بە بیتاقەی تەموین برێکی دیاریکراو چا و شەکر و هێلکە و پەنیر و شوکلاتەی وەردەگرت.

ئەو ماوە کورتەی لە لەندەندا مامەوە، "فاروق عیزەدین مەلافەندی" نەوەی مەلافەندی ئامۆزای باوکم سەردانی کردم، فاروق بەتەمەن لە من گچکەتر بوو، لە قوتابخانەی "ملفیلد"ی ناوەخۆ دەیخوێند، باسی کەشوهەوای بەریتانیا و خراپیی بارودۆخ و خواردنی ئەوێی بۆ کردم.

ئامانج لە چوونم بۆ کۆلێجی "گیلد فۆرد"ی هونەری خۆئامادەکردن بوو بۆ ئەو ئەزموونەی کە زانکۆ داوای دەکرد، ساڵێکی تەواوم لەوێ بەسەربرد، گیلد فۆرد شارێکی خۆپارێز بوو، کەوتبووە ناوەندی هەرێمی "سەری" سەوز، وەک هەموو گوندە ئینگلیزییەکان ئەویش بە گردۆڵکە و دارستانەکانی شوێنێکی دڵرفێن بوو، زۆربەی قوتابیانی کۆلێجی گیلد فۆرد خەڵکی شارەکە یان هەرێمەکە یاخۆ ناوچە نێزیکەکان بوون جگە لە هەندێکی بیانی کە تێبینیم کرد زۆربەیان هیندی و پاکستانی بوون، پۆلەکان بچووک و لەسەر شێوەی هەڵقەیی بوون کە ئوستادێک سەرۆکایەتیی دەکرد، ساتەکانی خوێندن بە موحازەرەی مامۆستا دەستی پێ دەکرد و پاشان هەموو بەشداریی گفتوگۆیان دەکرد.

ئەو ساڵەی کە لە گیلد فۆرد بووم، چاوم بە "نورمان دانیال" بەڕێوەبەری ئینستیتوی بەریتانیا لە بەغدا و "روث"ی هاوسەری کەوت، ئەوان بەسەردانێک

هاتبوونە لای دایکی نورمان لە گیلد فۆرد، چەند جارێک لە ماڵەکەیاندا سەردانم کردن و باسی بەغدا و ژیان لە ئینگلتەرامان کرد، بەرێگەی "نورمان" و "روث"ەوە "بیتەر"ی برا گچکەی "نورمان"م ناسی، هەرسێکیان سۆسیالیست و سەر بە پارتی کرێکاران بوون، ئەوەی کە لەو کاتەدا سەیر هاتە بەرچاوم ئەوانە هەرچەند باوەڕیان بە سۆسیالیزم هەبوو، هەروەها باوەڕیان بە کڵێسای کاسۆلیکیش هەبوو، بەرێگەی ئەوانەوە زانیم کە کاسۆلیکییەت وەک کێشەیەکی فەلسەفی لای ئەدیبان و بیرمەندانی ئینگلیز مانای چ دەدا لەمانە "تی- ئێس- ئیلیۆت"ی شاعیر و رۆمانووسانی وەک "گراهام گرین" و "ئیڤلین وۆ" و "هیلیەر بیلوک"، هەروەها نووسەری فرەنسایی "فرانسوا مورياك"، بیتەر لە هەمووان زیاتر لەلایەنی فەلسەفیی ئاین قووڵ بووبووەوە، دیارکەوت کە لە هەموو بەرهەمەکانی "کیرکیگارد"ی تۆژیبووەوە.

بەرێگەی ئەوانەوە، گەورەیی "تی- ئێس- ئیلیۆت"ی شاعیرم دۆزییەوە، "روث" قەسیدە بەناوبانگەکەی "وێرانە خاک"ی بەدەنگێکی کاریگەر دەخوێندەوە و بەیتەکانی لێک دەدایەوە:

ئێمەی پیاوانی پووچ
مێشکمان پڕە لە (کا) و بەداخەوە
وشەکانمان هیچ مانایەکیان نییە

دیسان بەرێگەی ئەوانەوە، گەورەیی "گراهام گرین" و مانای قووڵی رۆمانەکانیم دۆزییەوە کە لە رووکەشدا وەک چیرۆکی پۆلیسی ئاسایی خۆ دەنوێنن، بەڵام لە ناوەرۆکدا مانای فەلسەفی و ئاینیی ئاڵۆزیان هەیە. دوای گیلد فۆرد، ساڵێکم لە نێوان لەندەن و ئەدنبرە بەسەربرد و بەشی هەرە زۆری لە لەندەن بوو، لەوێ مرۆڤ کاتێک پیاسە بەناو هەندێک گەڕەک و شەقام و رێگەکاندا دەکات هەست بە ماندووبوون ناکات، بگرە هەست بە چێژێکی بێ کۆتا دەکات کاتێک باڵەخانە و دوکان و خانووەکان دەبینێت، یەکێک لەو گەڕەکانە ناوچەی "بلومسبری" نێزیک مۆزەخانەی بەریتانیا بوو، ئەو ناوچەیە کەشوهەوای تایبەت و سروشتی بیناسازی و ژیاری جیاوازە، هەر لەو گەڕەکانە مەیدانی "بد فورد"ە کە قوتابخانەی بەناوبانگی AA بۆ بیناسازی لەوێ بوو، ئەو مەیدانە نموونەیەکی نازداری

بیناسازیی سەدەی هەژدەمی تێدابوو کە بەشێوازی "جۆرجی" ناسراوە و پشت بە هاوسەنگی دەبەستێت، خانووە بەیەکەوە گونجاوەکانی گەڕەکی "چەلسی"ی نێزیک گۆڕەپانی "سلۆن" زۆر جوان بوون، سەیری ڕووی دەرەوەی خانووەکانم دەکرد کە زۆر بەیەکەوە هاوسەنگ و گونجاو بوون، پەنجەرە و دەرگەکانیان دوورییان هاوشێوە و بە ناوچەیی دابەش کرابوون، کاریگەری قوتابخانەی جۆرجی تا سەدەی نۆزدەم بەردەوام بوو بەو شێوازەی کە سەرەتای ئەم سەدەیەی جیا کردەوە، ئەو سیمایانە لە باڵەخانە جوانە گونجاوەکانی نێزیک "ریگنت پارک"ی ناوەڕاستی لەندەن بەدیار دەکەون.

لە شوێنە پڕ چێژەکانی لەندەن "چێرینگ کروس"، کە کتێبخانەکان لەوێن، ئەو کتێبە کۆنانەی کە ماوەیەکی زۆر بوو لە بازاڕدا نەمابوون لە کتێبخانەی چەند نهۆمی "فویلز" دەست دەکەوتن، هەر لە شوێنە پڕ چێژەکانی لەندەن، سەردانی مۆزەخانەی "تیت" بۆ هونەری نوێ بوو (Tate Gallery)، لەوێ تابلۆی هونەرمەندە ناودارەکانی سەدەی هەژدەم بەرچاو دەکەوتن.

لەو ساڵەدا، لە لەندەن بوارم بۆ ڕەخسا کە ئەکتەرە دیارەکانی شانۆی بەریتانیایی لەسەر شانۆدا ببینم، لەمانە "لۆرنس ئولیفیە، جۆن کیلکود، رالف ریچاردسون، مایکل ردگریف، ئەدیث ئیغانز، سیبیل ثور، فلۆرا روبسون، ماتیتاهنت"، "لۆرەنس ئولیفیە" و "فیفان لی"م بینی لە شانۆگەریی "میر" و "ئافرەتی نمایش" کە لە نووسینی "تەرنس راتیگان" بوو، لەو ئەزموونەی هەرگیز لە بیری ناکەم بینینی "ئۆرسون ویلز" بوو لەگەڵ "بیتەرفینگ" لە شانۆگەریی "ئوتێللۆ" کە ڕۆڵی "ئوتێلۆ" و "ئیاکۆ"یان دەبینی، هەر لە بیرەوەرییەکانی شانۆ، بینینی "چارلس لۆتۆن" بوو لەسەر شانۆ کە لە میهرەجانی ئەدنبرەدا هەڵبژاردەی شیعری ئینگلیزیی دەخوێندەوە، هەروەها "نوئیل کوارد"م لە شانۆگەریی "لابردنی پلانەکەدا" کە لە نووسینی "برناردشۆ" بوو بینی.

ڕۆژێکیان، شاباش (ریکلام)ێکم خوێندەوە کە باسی هاتنی "لوریل" و "هاردی"یان لە هۆڵی ودەوە بۆ برایتۆن دەکرد، دەتوانرا لە لەندەن تیکیت بکڕی، بەنیسبەت "لوریل" و "هاردی"یەوە دەگەڕانەوە بۆ رابردوویەکی دوور واتە یەکسەر ماوەی پەیدابوونی سینەمای بێدەنگ، نەمدەزانی ئەو دووانە لە ژیاندان، توانیم

تیکیت پەیدا بکەم و لە "برایتون"دا بیانبینم، ئێوارەیەک کە لە بیر ناچێتەوە، هەروەها لە یەکێک لە شانۆیە نێزیکەکانی "ترافلکەر سکویەر" توانیم "مۆریس شیڤالیە" بە شەپقە بەناوبانگەکەیەوە ببینم کە لە کا دروست کرابوو.

لەو ماوەیەدا، چوومە ئاهەنگی مۆسیقای سالانە کە لە هاوینان ساز دەدرا و پێیان دەوت (Prom concerts ) و لە "رویال ئەلبرت "هۆڵ" نێزیک شوێنی دانیشتنم پێشکێش دەکران، سەرۆکی ئۆرکسترا لەو ئاهەنگانە "سیرمالکوم سارگنت" بوو، ساڵی ١٩٥٢ بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ئۆپێرام بینی ئەمیش ئۆپێرای عایدە بوو کە هی موزیکزانی ئیتالیایی "ڤێرد"ی بوو و لە شانۆی ئۆپێرای مەلیکی "کوڤنت گاردن" پێشکێش کرا، دوای ئەمەش بە چەند مانگێک دوا پرۆڤە (Dress Rehearsal) ئۆپێرای ساندریللا موزیکزانی ئیتاڵیایی "روسینی"م لە شانۆی ئۆپێرای "گلایندبورن"دا بینی، تیکتی ئەو نواندنانە بۆ جەماوەر بەنرخێکی هەرزان دەفرۆشران.

گلایندبورن، کەوتبووە ناوەڕاستی گوندی ئینگلیزی لە هەرێمی "سسکس" کە بەدیمەنی دڵرفێن دەورە درابوو، ئەو شوێنە لە ئەسڵدا ماڵی هاوینەی "جۆن کریستی" یەکێک لە دەوڵەمەندە ئاشقەکانی ئۆپێرا بوو، بەڵام خۆشەویستی بۆ ئۆپێرا و "سپرانۆ"ی هاوسەری وای کرد ئەو هاوینەهەوارە بکات بە ماڵی ئۆپێرا کە لە دواییدا بووە بەناوبانگترین ماڵی ئۆپێرا لە جیهاندا، بەڕێوەبەر و دەرهێنەری زۆربەی ئۆپێراکان هونەرمەندی ئەڵمانیایی "کارل ئیبەرت" بوو، لەو ماڵە جوانەدا ئۆپێرای ساندریللام بینی، شەوێکی خۆش بوو.

بەناوبانگترین گۆرانیبێژی ئافرەت و خاوەنی جەماوەرێکی میللی سالانی پەنجاکان لە بەریتانیا (Contralto کاثلین فریەر) بوو، لە تەمەنی (٤٠) ساڵی بە نەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد و خەسارەتێکی گەورە بوو.

سەرەتای هاوین، فوئاد رەزا کە "ڤیولا"ی دەخوێند لە "کونسرتڤتوار"ی پاریسەوە تەلەفۆنی بۆ کردم و هانی دام بچمە پاریس و هەفتەیەک لەوێ بم، وتی "جەواد سەلیم و لورنای هاوسەری بەسەردانێکی کورت لە ئینگلتەراوە دێنە ئەوێ"، بیرۆکەکەم پێ باش بوو و چوومە پاریس، لەوێ لەگەڵ هەرسێکیان هەفتەیەکی خۆشم بەسەربرد، رۆژێکی تەواومان لە مۆزەخانەی ئیمپریشیونیزمەکاندا

بەسەربرد، ئەزموونێکی زۆر نازدار بوو کە تابلۆکانی "رینوار" و "دیگا" و "مۆنیی" و "مانێ" و "سیسارو"مان بینی، رۆژی پاشتر جەواد ئێمەی بردە کاتدرائیەی بەناوبانگی "شارتەر" کە بە شووشە ڕەنگاوڕەنگە دەگمەنەکەی ناسراوە، جەواد بەخرۆشەوە باسی مێژووی کاتدرائیەکەی بۆ کردین.

ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٣ چوومە کۆلێجی "فیتزولیام" لە زانکۆی کامبردج، لە رۆژی یەکەمدا بە دیارکەوت کە خوێندنی زانستی سیاسی بە دوو هێڵی هاوتەریبدا دەڕوات، هێڵی یەکەم ئەو وانانەن کە لە کاتی وتنەوەیاندا هەموو قوتابیان ئامادە دەبن، هێڵی دووەم دیداری هەفتانەیە لەگەڵ (supervisor) "سەرپەرشتیار" کە بریتییە لە هەڵقەیەک و کۆمەڵێکی دیاریکراو لە قوتابیان ئامادە دەبن، یەکێک لە قوتابییەکان بە رێککەوتن لەگەڵ (supervisor) وتارێک ئامادە دەکات و لە دیداری هەفتەدا گفتوگۆ لەبارەی وتارەکەوە دەکرێت.

لە یەکەم دیداری هەفتەدا، لیستێکیان بەناوی هەندێک سەرچاوە پێ داین و وتیان پێویستیمان پێی دەبێت، لەمانە "کۆماری ئەفلاتوون، میری میکاڤیللی، کتێبی (Leviathan)ی توماس هوبز، کتێبی "دوو تیۆر لەبارەی حوکم"ی جون لوک، "بنەماکانی ئابووری" ئەلفرد مارشاڵ، "سامانی نەتەوەکان"ی ئادەم سمیث، "مێژووی هزری ئابووری"ی ئەریک رۆل، گرێبەستی کۆمەڵایەتیی جان جاک روسۆ، نامەکانی مێژوونووسی بەریتانیایی لۆرد ئەکتون، تۆژینەوەی مێژووی تۆینبی، مێژووی فەلسەفەی رۆئاوای برتراند راسل، مێژووی کۆمەڵایەتیی ئینگلتەرای ل. جی. أ. م، مێژووی ئابووریی بەریتانیای سۆلتماش".

وەک هەموو قوتابیانی تر، دوای تەواوبوونی وانەکان زۆربەی کاتم لە کتێبخانەی کارشال- بەشی ئابووری- کتێبخانەی زانکۆ لەوبەری رووباری کامب بەسەردەبرد، قوتابییە کوڕ و کچەکان بە پایسکیل هاتوچۆیان دەکرد و هەروەها زۆربەی مامۆستایانیش پایسکلیان بەکار دەهێنا، وەک قوتابیانی تر لە هەفتەی یەکەمی کۆرسەکەدا پایسکلێکی بەکارهێنراوم کڕی.

هزری سیاسی و تیۆرەکانی فەرمانڕەوایی هەر لە ئەفلاتوونەوە تا دەگاتە ئەکویناس و میکاڤیللی و جان جاک رۆسۆ و جۆن لوک و تۆماس هۆبز و کارل مارکس پانتاییەکی فراوانیان لە خوێندندا داگیر کردبوو، هەروەها سەرهەڵدان و

بڵاوبوونـەوەی دیموکـراسـیـیـەت و لیـبـرالیـەت لـە جـیـهـاندا هـەر لە بـڵاوبوونەوەی (Magna Carta) تا گـرێبـەندی کـۆمـەڵایەتی و بـەڵگەنامـەی سـەربەخـۆیـی وڵاتە یەکگرتووەکان بەڵگەنامەی گرینگ بوون.

رێککەوتنێک لەسـەر ئەوە هەبوو کە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان بنەمـای بنەڕەتی هەر رێژیمێکی دیموکـراسین لەگـەڵ جـیـاوازی لـە وردەکـاری و ئەزمـوونـی هـەر دەوڵەتێک، بۆ نمـوونە سـەرەڕای دابەشـبـوونی دەسـتـەڵاتەکـان لە رێژیمی فـیـدراڵیی ئەمـەریکایی لە نێوان "یاسـادانان- جێـبـەجێکردن- دادوەری"، بەڵام بە هێڵـێکی تەریبی هـاونموونە لەگەڵ دەسەڵاتەکان لە نێوان حکوومەتی فیدراڵی و حکوومـەتی ویلایەتەکاندا دەڕۆیشت.

چێژێکی گەورەم لە خـوێندنەوەی- برتراند راسل- وەردەگرت، کـتێبی مـێژووی فـەلسـەفـەی رۆئاوا بە نـیـسـبـەت مـنەوە گـرینگـترین سـەرچـاوە بوو بۆ ناسـینی "ئەرسـتـۆ- ئەفـلاتوون- ئەکـویناس- سـپـینـۆزا- شـۆپـنهـاوەر- کـانـت- دیکارت- هیگل- نیـچـە- مـارکس"، لەو کـتێبـەدا راسل بۆ هـەر فـەیلەسـووفێک بەشـێوەیەکی سادە و لۆجیکی و روون شرۆڤەی بابەتییانەی کردووە.

برتراند راسل، گەورە فەیلەسـووفی سەدەی بیستەم بوو، خوێندنەوەی کتێبەکانی بە نیسبەت منەوە سەرەتای چوونە ناو دنیایەکی تازە بوو، جیهانێک کاروبار تێیدا روونە کـە پێـشـتـر شـڵـەژاو بوو، راسـل ئەوەی روون کـردەوە کـە زمـان و خـراپ بەکـارهێنانـی زمـان کـۆسـپـی سـەرەکین لە بەردەم بەیەکگەیشـتنی خـەڵکدا، وشـە ئەگەر لە ناوەڕۆکە لۆجێکی و زانسـتییەکەی داماڵرا دەسـتەپاچە دەبێت لە گێڕانی رۆڵەکەی وەک ئامێرێکی گواسـتنەوەی زانیاری، مرۆڤیش لە چەمکی ئەو جیـهانەی کە دەوری داوە و تێگەیشـتنی ئەوانی تریش دەسـتەپاچە دەبێت ئەگەر زمانی خراپ بەکـار هـێنا، لەو پێودانگەوە راسـل زمـانی بەهـەردوو زانسـتی لۆجیک و بیـرکاری پێـوەسـت کـردبوو، راسـل دامـەزرێنـەری فـەلسـەفـەی ئیـجـابیی لۆجـیکـی بوو، فەلسـەفەکە گرینگترین بزاڤی فەلسـەفی بوو لە بەریتـانیـا لە سـەدەی بیسـتـەمـدا، یەکێک لە پێشەواکانی ئەو فەلسەفەیە "مورۆ و ڤنکشتاین" بوون.

مـانای وشـە یـان ئەو مـەبەسـتـەی کـە دەیگـەیەنێت بە جـیـاوازیی مـرۆڤ و ئەو شـارسـتـانیـەتیـیـەی کـە پێـیـوە بەسـتـراوە دەگـۆڕێت، بۆ نموونە وشـەی

"Compromise"ی ئینگلیزی هاوماناکەی بە عەرەبی "چارەسەری مامناوەند" دەگەیەنێت و لە بیرکردنەوەی رۆئاوایش مانای "میانرۆ" دەگەیەنێت، ئەمەش بۆ کۆمەڵێک هۆکار دەگەڕێتەوە لەمانە کاریگەری جەدەلیەتی عەقلانیەتی دیکاری کەڵەکەبوو لە کولتووری رۆئاوادا لە سەدەی هەژدەمەوە کە پشت بەم هەیکەلە دەبەستێت "thesis synthesis thesis anti"، هەمان وشە لەبیرکردنەوەی رۆهەلاتیدا مانای "پاشەکشە و بەزین" دەگەیەنێت، ئەمەش لە دیدە خێڵەکییە رۆمانسییەکەوە سەرچاوەی گرتووە کە گریمانەکەی ئەوەیە پێویستە مرۆڤ یان سەرکەوتوو بێت یاخۆ بەزیو، تیۆرە ئابوورییەکان بەشێکی گەورەی بەرنامەی خوێندنیان لە کامبردج داگیر کردبوو بە پێچەوانەی زانکۆی لەندەن کە "تیۆرەکانی کێنز" و تیۆرەکانی "هارولدلاسکی" سوسیالیستی بەسەر قوتابخانەی ئابووریی لەندەن زاڵ بوو، هەروەها مێژووش بەشێکی گەورەی لە خوێندندا هەبوو، بەڵام جەخت زیاتر لەسەر فەلسەفەی مێژوو مێژووی نووسینەوەی مێژوو بوو، مشتومڕێکی گەورە سەبارەت بەپێناسەی مێژوو، و ڕێگەکانی نووسینەوەی لە ئارادا بوو، تۆمارکردنی ڕووداوەکانی ڕابردوو بەوردی وا گریمانە دەکرا کە کارێکی ئاسان نەبێت و تەنانەت لە هەندێک حاڵەتدا مەحاڵیش بێت چونکە ئەوەی وەک ڕووداوی ڕابردوو و لە مێژووی ڕوودانیدا تۆمار کراوە سنووردارە، شتی تۆمارکراوی سنوورداریش وەک سەرچاوەیەکی بابەتی بێلایەن بۆ زانیاری پشتی پێ نابەسترێت، سەرەڕای ئەمەش بە تەنیا تۆمارکردنی ڕووداوەکان هیچ بەهایەکی نییە ئەگەر لێکدانەوە و شیکردنەوەی بابەتی زانستییانەی لەگەڵدا نەبێت.

ناتوانین لە ئێستا بگەین و بەشێوەیەکی دروست پلان بۆ پاشەڕۆژ دابنێین ئەگەر بەشێوەیەکی دروست لە ڕابردوو نەگەین، بەشێکی گەورە لە مێژووی بەشەرییەت کە نووسراوەتەوە لایەنگری تێدا بووە، بە چاویلکەی ڕەش و سپی سەیری بەشەرییەت کراوە، یان بە چاویلکەی گەورەکانەوە سەیری کراوە کە نابێت تانە لە گەورەییان بدرێت، یاخۆ ئەو شەڕانگێزانەی کە هەرچەند، ڕاستیی تازە بێتە ئاراوە ئەوان بەزەحمەت وێنەیان دەگۆڕێت.

یەکەم کتێب، کە گومانی لە گەورەکان پەیدا کرد کتێبی "گەورەکانی سەردەمی ڤیکتۆری" ئێل – سترینگ – بوو، لەو کتێبەدا نووسەر باس لە پاڵەوانە نەتەوەییەکانی بەریتانیا دەکات و ڕوونی دەکاتەوە، کە چەند لە پاڵەوانیتی و

گەورەییەوە دوور بوون، هەروەها کتێبەکانی مێژوونووسی گەورە "لۆرد ئەکتۆن" زۆربەی چەمکەکانی مێژووی گۆڕی، ئەکتۆن کەسێکی لیبرالی بوو، خاوەنی ئەو گوتە ناودارەیە کە دەڵێت: "دەسەڵات گەندەڵ دەکرێت و دەسەڵاتی رەهاش بەشێوەیەکی رەها گەندەڵ دەکرێت".

کتێبەکەی "ئەرنۆلد توینبی" کە ناوی "تۆژینەوەی مێژوو"ە یەک لەو سەرچاوانە بوو دەبوایە دەوری بکەمەوە، بەڵام ئەو کتێبە قەبەیە کە (٢٠) جزوبەند بوو ناچاری کردم پشت بە پوختەکەی ببەستم کە یەک جزوبەند بوو، تیۆری توینی ئەوەیە کە شارستانێتییەکان گەشە دەکەن و دەبووژێنەوە و دەگەنە ترۆپک و پاشان دادەبەزن و هەرەس دێن، هەموو شارستانیەتییەکی گەورە لە مێژوودا بەو خولانەدا دەڕوات، ئەمە تیۆری "شبنگلەر"یشە کە لە کتێبی "هەرەسی خۆرئاوا"دا باسی کردووە، بەڵام هەندێک جیاوازی لە نێوان ئەو دووانەدا هەیە، شبنگلەر دەڵێت کە سەرکەوتن و دابەزین هەڵقەیەکی حەتمین لە مێژوودا، بەڵام توینبی دەڵێت هەندێک لە شارستانیەتییەکان دووبارە دەگەڕێنەوە و گەشە دەکەن دوای متبوونێک کە سەدان ساڵ دەخایەنێت.

شیکردنەوەیەکی ماتریالیانەش بۆ مێژوو هەبوو کە ئابووری بەهۆکارێکی سەرەکیی دادەنا بۆ پەرەسەندنی مێژوویی بەڵام توینبی لایەنگری ئەو تیۆرە نەبوو، هەموو کات گوتە بەناوبانگەکەی- ئادەم سمیث-م بیر دێتەوە کە دەڵێت "تێرکردنی بەرژەوەندیی خودێتی (self interest) تاکەکان کۆمەڵگە دەبووژێنێتەوە بەڵام پێویستە جیاوازی لە نێوان بەرژەوەندیی خودێتی و تەماع (greed)دا بکەین".

پرسیارێکی تاقیکردنەوەی کۆتاییی ساڵی یەکەمم لە بیر ماوە، پرسیبووی "ئەفلاتوون بۆ لە کۆمارەکەیدا شاعیریی دەرکرد؟".

قوتابیان و مامۆستایانی کامبردج لە مشتومڕ و دایەلۆگی بەردەوامدا بوون چ لە نێوان خۆیان چ لەگەڵ ئەوانی تر، هەر شتێکیان بە مێشک داهاتبا لە بچووکترین کاروبارەوە تا کێشە چارەنووسسازەکان گفتوگۆیان لەسەر دەکرد، ئەو دایەلۆگانە لە کاتی فراڤین و شیوخواردن یان لە هۆڵی حەسانەوەدا ئەنجام دەدران، گفتوگۆ شێوازی ژیان و بەشێکی کولتووری کامبردج بوو.

یەکەتیی قوتابیانی کامبردج (Students Union) وێنەیەکی بچووککراوەی

ئەنجوومەنی نوێنەران بوو، قوتابخانەی راهێنانی سیاسەتوانان و فەرمانڕەوایانی دوارۆژ بوو، هەفتانە کۆڕێک ساز دەدرا و تێیدا مێوانداریی گەورە سیاسەتوانانی لەندەن و هەندێک سەرۆکی وڵاتان و کەسایەتییەکانی جیهان دەکرا، لەو کۆڕانەی کە لە بیرم ناچێتەوە مێوانداریکردنی "جەواهیر لال نەهرۆ" بوو، نەهرۆ لە سەرەتای کۆڕەکەدا وتی: "کە لە کامبردج قوتابی بووم خەونم ئەوە بوو لەم سەکۆیەدا قسە بکەم، بەڵام هەلم بۆ نەڕەخسا ئەو ئاواتەم بێتە دی، بۆی هەیە ئەو کاتە شەرمم کردبێت، بەڵام ئێستا، دوای ئەو هەموو ساڵانە بەسەر ئەو شەرمەدا زاڵ بووم و لەو باوەڕەدام دەتوانم بە ئازادی لەو سەکۆیەدا قسە بکەم"، قسەکانی نەهرۆ لەلایەن ئامادەبووانەوە بە چەپڵەڕێزان پێشوازی کرا کە چەند دەقیقەیەکی خایاند.

لە دیمەنە ئاساییە رۆژانەکانی کامبردج، بینینی ئەدیبان و بیرمەندان و ئابووریناسە جیهانییەکان بوو کە رۆژانە بە ڕاڕەوە تەسکەکانی کامبردجدا تێ دەپەڕین و ڕوویان لە هۆڵی وانە وتنەوە یان شوێنی دانیشتنیان لە کۆلێجەکاندا دەکرد، "ئی- ئێم- فۆستەر" یەکێک بوو لەوانە، (Fellow of King s College) و "کینز"ی برادەری گەورەترین ئابووریناسی سەدەی بیستەم بوو و لە ناوەڕاستی چلەکاندا کۆچی دوایی کرد.

لە نێوان قوتابییە کوڕ و کچەکانی کامبردجدا، کەسانی دیار لە ئەدەب و شیعر و شانۆ و فەلسەفە و ئابووری و پزیشکیدا هەڵکەوتن لەمانە "سیلفیابلاث" کە ژیانێکی پڕ کارەساتی بەسەربرد و خۆی کوشت، هەروەها ڕەخنەگری شانۆ و سینەماکار "جۆن رسل تایلەر"و دەرهێنەری شانۆیی "بیتەر هۆل".

لە کامبردجدا، دەمتوانی ڕوو لە هەر هۆڵێکی وانە وتنەوە بکەم ئەگەر پێوەندیی ڕاستەوخۆشی بەخوێندنەکەمەوە نەبووایە، لە کۆڕێکی "هربەرت رید" لەبارەی هونەری شێوەکارییەوە لە بەریتانیادا پاش دووەم شەڕی جیهانی ئامادە بووم، هەروەها لە کۆڕێکی "بڤسنەر – Pevsner" لەبارەی هونەر و بیناسازییەوە و لە کۆڕێکی (لیفس)دا سەبارەت بە ڕەخنەی ئەدەبی ئامادە بووم.

ناوبەناو سەردانی مۆزەخانەی "فیتزولیام"م دەکرد و ڕاستەوخۆ دەچوومە ئەو هۆڵەی کە تابلۆکانی "سیکرت"ی هونەرمەندی ئیمپریشیۆنزمی ناوداری ئینگلیزی

لەخۆوە گرتبوو. سەرەتای هاوین، بەسواری بەلەمە بەرزە درێژەکان کە پێیان دەوت (Punts) پیاسەمان بە ڕووباری- کامب-دا دەکرد، لە لێواری ڕووبارەکەوە باڵەخانە جوانەکانی کامبردجمان بە سەردەمە مێژووییە یەک بەدوای یەکەکانیەوە دەبینی هەر لە سەردەمی ڕۆمانییەوە تا گۆتی و ڕێنیسانس و ئینجا هەردوو سەدەی شازدەم و حەڤدەم و پاشان جۆرجی و دواجار سەردەمی ڤیکتۆری، بەردەوام دەبووین تا دەگەیشتینە گوندی "کرانگستەر"ی جوان لە لێواری کامبردج و لەوێ دەچووینە پشووگەی (Red lion)، میلی سەعاتی دیواری ناو پشووگەکە لەسەر سەعات سێ کەم دە دەقیقە راوەستابوو، ئەمەش کاتی گەیشتنی هەواڵی کوژرانی "روبەرت ئوین"ی شاعیری دەگەیاند لە دووەم شەڕی جیهانیدا، ئوین لە مێوانە بەردەوامەکانی ئەو پشووگەیە بوو، چەندان شیعری لەوێ نووسیوە لەمانە چامە بەناوبانگەکەی "سەعات سێ کەم دە دەقیقە (Ten to three).

ساڵی ١٩٥٦، مەلیک فەیسەڵی دووەم سەردانی زانکۆی "کامبردج"ی کرد، (Chancellor Vice) قوتابییە عێراقییەکان کە ژمارەمان ٦ کەس بوو بانگ کرد تا چاومان بە مەلیک بکەوێت، کەسێکی بەلوتف بوو، بە وشەی ناسک لە بارودۆخی پرسین.

ساڵی ١٩٥٦، ساڵی وەرچەرخان بوو لە ئینگلتەرا، لەو ساڵەدا دەستدرێژیی سێقۆڵی کرایە سەر میسر و لە ئەنجامدا هەموو شتێک لە بەریتانیادا قلّپ بووەوە، سەرنەکەوتنی هێرشی سەربازی و دەست لەکارکێشانەوەی "ئەشۆنی ئیدن" لە ئەنجامی خۆپێشاندانە گەورەکان کە سەرکۆنەی هێرشەکەیان دەکرد کاروباری لە بەریتانیادا گۆڕی، ئەو ڕووداوە کۆتایی سەردەمێک بوو لە بەریتانیادا و دەستپێکردنی سەردەمێکی تازە بوو، سەردەمی بەردەوامبوون و چاندنی تۆوی نەوەی شەستەکان، نەوەی ڤێتنام کە چەندان چەمک و دیدی تازەی لە ژیانی ڕۆئاوادا لەخۆوە گرت.

هەر لە ساڵی ١٩٥٦، شۆڕشێک بەجۆرێکی تر لە ئینگلتەرادا رووی دا، شۆڕشێک لە ئەدەب و شانۆ، نەوەیەکی تازە لە نووسەرە گەنجەکان پەیدا بوون، لە دیدێکی ریالیزمیانە کێشەکانیان دەخستە ڕوو کە پێشتر شانۆی ئینگلیزی بەخۆیەوە نەبینیبوو، شۆڕشەکە لە شانۆیەکی گچکەوە دەستی پێ کرد کە ناوی

"رویال کورت" بوو، کەوتبووە گۆڕەپانی سلون لە گەڕەکی چلسی دەرەوەی ویست ئاند، واتە دەرەوەی شانۆ گەورەکان، شۆڕشەکە بە شانۆگەریی "بەتووڕەیی ئاوڕێک لە رابردوو بدەرەوە" کە نووسەرێکی نەناسراو بەناوی "جۆن ئۆزبۆرن" نووسیبووی دەستی پێ کرد، شانۆگەرییەکە لەلایەن ڕەخنەگرانەوە فەرامۆش کرا جگە لە ڕەخنەگر "کینیش تاینان"، ڕەخنەگری شانۆیی لە رۆژنامەی ئۆبزێرڤەر تاینەن، ئەو شانۆگەرییەی بەگرینگترین شانۆگەرییەکانی دوای دووەم شەڕی جیهانی وەسف کرد و پاڵەوانەکەی "جیمی بورتەر"ی بە هاملێتی سەدەی بیستەم چواند، ئەو ڕەخنەگرە وتارەکەی بەم شێوەیە کۆتاییی پێ هێنا "ناکرێت رێزی کەسێک بگرێت ئەگەر ئەم شانۆگەرییەی نەبینیبێت".

ئەو وتارە بۆمبێک بوو و شۆڕشەکەی هەڵگیرساند، رۆژی پاشتر و دوای بڵاوبوونەوەی هەزاران کەس لە گۆڕەپانی سلون کۆ بوونەوە تا پلیت بکڕن و شانۆگەرییەکە ببینن، لە شەو و ڕۆژێکدا، شانۆی روویال کورت بووە پەناگەی هەزاران کەس لە بەریتانیا و تەنانەت ئەوروپاش کە بۆ بینینی شانۆگەرییەکە هاتبوون، ئەم شانۆگەرییە دەسپێکی شانۆی تووڕە و ریالیزمی تازە بوو لە شانۆ و ئەدەبی ئینگلیزیدا.

لەو ماوەیەدا رێبازە تازەگەر و نوێخوازییەکان لە شانۆی ئەورووپایی سەریان هەڵدا و ئامادەگییەکی گرینگیان لە ئینگلتەرادا هەبوو لە "ویست ئاند" چەند شانۆگەرییەکی برێخت پێشکێش کران، جگە لە داستانە شانۆگەرییەکانی برێخت شانۆگەریی ناماقووڵیش بایەخێکی فراوانی لەلایەن رەخنەگران و جەماوەرەوە پێ درا، "لورەنس ئولیفیە" یەکێک لە کۆڵەگەکانی شانۆی شکسپیری رۆڵی سەرەکی لە شانۆگەریی "کەرکەدەن"ی یۆنیسکۆدا بینی، هەروەها "بیتەر بول" رۆڵی "بۆزۆ"ی خوێنرێژی لە شانۆگەریی "لە چاوەڕوانی گۆدۆ"ی سموئیل پیکیتدا بینی کە لەسەر شانۆی "کریتریۆن" لەویست ئاند پێشکێش کرا، دەرهێنەری گەورەش "بیتەر زادک" شانۆگەریی "بانیژە"ی جان جینیەی دەرهێنا و لەسەر شانۆی هونەرەکان پێشکێش کرا.

ساڵی ١٩٥٧ دوای شەش ساڵ دابڕان گەڕامەوە بەغدا، ئەوەی سەرنجی کابرایەکی وەکو منی ڕاکێشا، کە لە بەریتانیاوە هاتبوومە بەغدا، پاسە سوورە لەندەنییە دوو نهۆمەکان بوو، پاسەکانی بەغدا لەگەڵ هی لەندەن جیاوازییان نەبوو، تازە دروست کرابوون، کاتی ڕۆیشتن و گەڕانەوەیان ڕێک خرابوو لە کاتی دیاریکراودا، پشکنەری تیکیت بە جلوبەرگی فەرمییەوە هەمووده‌م ڕووخۆش دیار بوون وەک لەندەن، ئەو پاسانە باشترین هۆکاری گواستنەوە بوون لە بەغدا.

دوای گەیشتنەوەم بۆ بەغدا بە چەند ڕۆژێک، لە ناوچەی شۆریجە بە ئاراستەی باب ئەلشەرقی شەقامی ڕەشیددا پیاسەیەکم کرد، لەلای ڕاستەوە دۆندرمەی فەلەستین هەر لە شوێنی خۆی بوو، سینەمای حەمرا و بەرگدرووی "ستراک"یش هەروەها، کۆگای درهەم لەلای چەپ و کتێبخانەی مەکەنزی لەلای ڕاست، چوومە کتێبخانە و کەریم موورادی خاوەنی کتێبخانەکە بەخێری هێنام، وەک جاران برادەرە سیاسی و ئەکادیمییەکانی دەورەیان دابوو، لەگەڵ کتێبخانەیەکی لەندەندا هیچ جیاوازیی نەبوو، کتێبخانەکەم جێ هێشت و ڕووم لە پردی مۆد کرد "پردی-الاحرار-ی ئێستا"، بەلای سەرتاشخانەی بەدریدا تێ پەڕیم، لە دەروازەی پردەکە بەلای ڕاستەوە "شریف و حداد" وەک جاران تژی بوون لە خەڵک، هەردوو وێنەگران "عەبوش" و "ئەرشاک" هەر لە شوێنی خۆیاندا بوون، لەلای چەپەوە پێڵاوفرۆشی "رید شوز" و ئینجا هەردوو سینەمای ڕەشید و وەتەنی، بەلای دوکانی عەمۆ ئەلیاس بۆ خواردنی سووک تێ پەڕیم لەلای ڕاستەوە تا گەیشتمە قاوەخانەی بەرازیلیە کە قاوەخانەی سویسرایی بە تەنیشتیەوە بوو، لەلایەکی تری شەقامەکەوەش سینەمای زەورا بوو، لە قاوەخانەی بەرازیلیە داوای قاوەیەکم کرد، هیچ شتێک لە قاوەخانەکەدا نەگۆڕابوو، کورسییەکانی پێشەوەی ڕۆخ شەقامەکە وەک جاران خوێنەرانی ڕۆژنامە و کۆوارەکان لەسەری دانیشتبوون.

سەرنجم دایە شەقامەکە، سەیری دەموچاوی ڕێبواران و هاتوچۆکەرانم دەکرد کە لە نێوان خۆیاندا پێ دەکەنین، لە پڕ هەستم بە شادییەکی بێ پایان کرد،

هەموو شتێک جوان دەهاتە بەرچاو، شەقامە گەورەکە، خەڵک، باڵەخانە تەقلیدییەکان، بار و قاوەخانەکان، لە بەردەم دوکانێکی کارەباییاتدا خەڵکێکی زۆر کۆ بوویوونەوە، سەیری بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنیان دەکرد کە لە مۆخازەکە دانرابوو، بیرم کەوتەوە وا تەلەڤزیۆن گەیشتە عێراق و یەکەم وڵاتە لە ناوچەکەدا توانای وەشانکردن و بینینی بەرنامەی تەلەڤزیۆنی هەبێت.

قاوەخانەی بەرازیلیم جێ هێشت و ڕووم لە باب ئەلشەرقی کرد لە ڕێگە پۆستەرێکی گەورەم بینی کە لێی نووسرابوو تیپی (Modern Jazz Quartet) بە سەرکردایەتیی (Dave Broubeck) گەیشتووەتە بەغدا و هەفتەی داهاتوو ئاهەنگێکی موزیک لە سینەمای خەیام ساز دەدات، باوەڕم بەمە نەکرد، چونکە دیڤید بروبک تا ئێستا سەردانی بەریتانیای نەکردبوو سەرەڕای ئەوەی کە لە نێوەندی ڕۆشنبیران و قوتابیانی زانکۆکانی بەریتانیا جەماوەرێکی میللیی فراوانی هەبوو، لە سینەمای خەیام ئەوەی بینیم جێگەی سەرسوڕمان بوو، جگە لە توانای ئامێرژەنەکان پێشوازی و جۆش و خرۆشی جەماوەر وای لە بروبک کرد کە لە کۆتاییی ئاهەنگەکەدا بە هەڵچوونێکی گەورەوە بڵێت: "ئەوەی ئەمشەو لە پێشوازیی جەماوەردا بینیم قەت لە بیر ناکرێت، لەوەتەی ئەمەریکام جێ هێشتووە ئەمە باشترین پێشوازییەکە بینیومە".

هەر دوای گەڕانەوەم بۆ بەغدا، فیلمی "سەعیدە فەندی" یوسف ئەلعانیم بینی لە سینەمای ئۆرفەلی نێزیک گۆڕەپانی - النصر-، جەماوەر بە هوتاف کێشان سەیری فیلمەکەیان دەکرد، بایەخی ئەو فیلمە لەوەدا بوو کە هاوشان بوو لەگەڵ تەوژمی ریالیزمی تازە لە ئیتاڵیا کە- دی سیکا- دەستی پێ کرد، فیلمەکەی عانی لە رووی جوانکاری و مرۆڤدۆستییەوە هیچی کەمتر نەبوو لە هەردوو فیلمی "پایسکل دزەکان" و "ئەمبرتووی" کە وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە سینەمای ئیتاڵیایی دوای دووەم شەڕی جیهانی.

بەغدا شارێکی هاوچەرخی کراوە بوو بەسەر دەرەوەدا، هیچ کۆت و پێوەندێک بەسەر ئەوانەوە نەبوو کە دەهاتن یان دەچوون وەک هەموو شارە پێشکەوتووەکان سروشتێکی کۆسمۆپۆلێتی ڕوونی هەبوو، هەرچەندە کۆت و پێوەند لەسەر سەفەر نەبوو، بەڵام هاوینەهەوارەکانی لبنان بە پلەی یەک پشتیان بە گەشتیارە

عێراقییەکان دەبەستا، لەندەنیش لە مانگەکانی هاویندا هەزاران گەشتیاری عێراقی روویان تێ دەکرد رۆژانە لە شەقامی ئۆکسفۆرد دەبینران.

کۆگە بەناوبانگەکانی بەغدا وەک "حسو اخوان، ئوروزدی باک، نوفکس، لیبرتی" و کۆگەی "صبری" و "شبیبی" باشترین و نوێترین جلوبەرگ و کەلوپەلیان دەفرۆشت، دوکانەکانی- سپێنس- هەموو جۆرە خواردەمەنی و پەنیرێکیان دەفرۆشت.

هوتێلەکانی بەغدا وەک "بەغدا، خەیام، زیا، ریجنت پالاس، سندباد" خاوەن ئاستی بەرز بوون، هەروەها هوتێلی – شط العرب- لە بەسرە و هوتێلەکانی – سکک – لە مووسڵ و هەولێر و کەرکووک هوتێلی دیار بوون.

ئەو کاتە عێراق رووی لە گەشەسەندنی ئابووری کردبوو، ئەمەش کۆمەڵێک هۆکاری هەبوو لەمانە سیاسەتی ئابووری کە دەوڵەت رەنگرێژی کردبوو و کە جەختی لەسەر دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤی نەوت دەکرد وەک داهاتێک، ئەمیش بە بووژاندنەوەی کەرتەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی و گەشتیاری.

رێژەی زۆریی ئیراداتی نەوت بۆ ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوە بوو، بودجەی کارپێکراو پشتی بە باج و رسومی گومرگی و ئیرادە نانەوتییەکان دەبەست، ئەو پارە تەرخانکراوە دوور بوو لە تەخشان و پەخشان و زێدەرۆیی، ژمێریاری حکوومەتی لەلایەن وەزارەتی داراییەوە خرابووە ژێر وردبینییەکی توندەوە، بۆ نموونە وەزیرەکان ئۆتۆمۆبێلی تایبەتی خۆیان بەکار دەهێنا، حکوومەت ئۆتۆمۆبێلی بۆ دابین نەدەکردن، گەندەڵیی ئیداری زۆر کەم بوو.

هۆکارێکی تری بووژاندنەوە، ئابووریبوونی چوارچێوەی دامەزراوەیی و ژێرخانی گونجاو بوو، بە دامەزراوەییکردن لە عێراقدا لە رۆژانی یەکەمی فەرمانڕەواییی نیشتمانیدا رەگی داکوتابوو، دەوڵەت دەوڵەتی دامەزراوەکان و یاسا بوو، ئاسایش و هێوری بەرقەرار بوو، بەبێ ئەو دووانە پەرەپێدان نەدەکرا، ژێرخانی گونجاو بۆ وەبەرهێنان دەستەبەر کرابوو، کەرتی دارایی شارەزا و کاریکەر بوو، دەزگایەکی بانکی پێشکەوتوو هەبوو، دەیتوانی بە ئاستێکی بەرز کارگوزاری بانکی پێشکێش بکات، جگە لە بانکی رافیدەین دەیان بانکی بازرگانیی بیانی لە عێراقدا هەبوون.

کەرتی تایبەت لە عێراقدا بە راستەرێدا دەڕۆیشت، کەرتی هەناردنە دەرەوەی

تایبـەت بووژایەوە، بەرهەمــەکـانی عـێـراق لە بازاڕی وڵاتە دراوســێکان ســاغ دەبوونەوە، لـە ڕووی کـشـتـوکـاڵەوە عـێـراق بەرهـەمــەکـەی بەشـی خـۆی دەکـرد و دانەوێڵــەی دەنارده دەرەوە، کـۆمـپـانیـا تایبـەتیـیـەکـانی شـیـرەمــەنی وەک وڵاتە ئەوروپاییەکان بەرهەمەکانی دەنارده مالان.

لەلایـەکی ترەوە، توێژێکی کـۆمــەڵگەی عـێـراقی لـە ئاسـتی ژێرەوەی هـەژاریدا دەژیان، بەتایبەتی لە گوندەکان، کاتێک ئەو بابەتە دەورووژێندرا وەرامیان ئەوە بوو کـە ئەمــە قـۆناغـێکە و لەگـەڵ بەرزبوونەوەی تێکڕاییـی بووژاندنەوەی ئابووری و زیادبوونی تێکڕای داهـاتی تاک و دابـەزینی تێکڕای بێکاری و دابـینـکردنی هـەلی کار لە ئەنجامی فراوانبوونی جێبەجێکردنی پڕۆژەکاندا بەسەردەچێت.

عێراق، لە وڵاتە دامـەزرێنەرەکانی سیپـەی دراوی نێودەوڵەتی و کۆمـەڵەی بانکی نێودەوڵەتی بوو، پاش پارزەوینی ئەوروپا تاکە وڵات بوو کـە سـاڵی ١٩٥٠ بڕی (٥) ملیـۆن دۆلاری بە قـەرز لـە بانکی نێـودەوڵەتی وەرگرت، ئـەمـەش بەڵگەی پایەداریی عێراق بوو لـە ڕووی داراییـیەوە لەو کـاتەدا، عێراق ئەو قـەرزەی بۆ جێبـەجێکردنی پڕۆژەی "ثرثار" تەرخــان کـرد و توانـی بەر لەوەی هـیـچـی بکەوێتـە ســەر و لـەبەر ڕۆشنـاییی دەسـکاریکردنی ڕێککەوتننـامــەی نەوت قــەرزەکــە بداتەوە. بـە هـەمــوو پێـوەرە ئابوورییـەکـان، عێـراق بە راسـتـەڕێدا دەڕۆیشت، وا مـەزەنـدە دەکرا دوای (١٠–١٥) سـاڵ ئـەگـەر ئەو سـیـاسـەتە حـەکیـمـانەیە بەردەوام بـوایە دەچووە ریزی وڵاتە پێشکەوتووەکان.

سـەرەتای ساڵی ١٩٥٨، لە کۆمپانیای نەوتی عێراق لە کەرکووک دامـەزراوم، لە ڕۆژی یەکەمدا بەڕێوەبەری گشـتیی کۆمپانیاکە مسـتەر "ثورنلو" چاوی پێم کەوت، دوایی مـەنسوور خەیات کـە لە ڕووی کارگێڕییـەوە سـەر بەو بووم چاوی پێم کەوت، شوێنی کارکردنم لـە کارگێڕیی گشـتی بوو لە عـەرەفە و شـوێنی دانیشـتنیشـم لە ناوچەی بـابا بوو، لەو خـانووانـەی پێـیـان دەوت: "أعـزاب هـاوس" بەرامـبـەر یانەی فەرمانبەران و نێزیک سینەما.

هـەر لەو مـاوەیەدا، زەیدی برام بە ئەندام لە ئەنجـوومـەنی نوێنەران هـەڵبـژێردرا و پاشان بۆ ئەندامێتیی یەکەتیی هاشـمی تەنسیب کرا، وا بڕیار بوو ئەو ئەنجوومەنە بە نۆرە لە نێوان عەمان و بەغدا کۆبوونەوەکانی سـاز بدات، بەلام یەکەم کۆبوونەوە

دەبوایە لە عـەمـان بوایـە، هەروەها بڕیار درا هەمـوو ئەنـدامـانی شـاندەکـە بە سەرۆکایەتیی نووری سەعید سەرۆکی یەکەتیی هاشمی بە باڵەفڕەیەکی تایبەت سەفەر بکەن.

بەمەبەستی بەڕێکردنی زەید چوومە بەغدا، لە نێوان ئەندامانی یەکەتیی هاشمی چاوم بە فەیسەڵ دەمەلوجی کەوت کە کۆنە برادەری زەید بوو، ئەندامەکان چاوەڕوانی گەیشتنی نووری سەعید بوون، کە نووری سەعید گەیشت کۆمەڵێک ڕۆژنامـەی ئەو ڕۆژە و ئەوراقی لەبن هەنگڵ بوو و کـەس نەبوو بۆی هەڵبگرێت، بۆینباغەکەی لە گیرفانی چاکێتەکەی هاتبووە دەرەوە، نووری سەعید بە ڕووی خۆشـەوە سەیری ئەندامانی شاندەکەی کرد و سەرکەوتە ناو باڵەفڕەکە و ئەندامانی شاندەکەش دوای ئەو سەرکەوتن.

ڕۆژی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨، رادیۆی بەغدا رای گەیاند، کە سوپای عێراق ڕژێمی فەرمانڕەوای گۆڕیوە و دوای ئەوە هێرشی بردووەتە سەر کۆشکی- الرحاب - و مەلیک فەیسەڵی دووەم و میر عەبدولئیلا و سەرجەم ئەندامانی خانەوادەی مەلیکی کوژراون، دوای ئەوە بە چەند ڕۆژێک کاری خوێنڕشتن و دڕندانە ئەنجام دران، لاشەی عەبدولئیلا پارچە پارچە کرا و بە عامودی کارەبا هەڵواسرا، لاشەی چەند بیانییەکیش کە وەزیرانی عەرەبیشی تێدابوو لە هوتێل بەغدا بوون بەسەر زەوییەوە راکێشران، دوای چەند ڕۆژێکیش نووری سەعید کوژرا و بەوپەڕی دڕندانە و بەربەریانە لاشەکەی بەسەر زەویدا ڕاکێشرا.

کە قوتابی بووین، مامۆستای مێژوو فێری دەکردین شۆڕش کاتێک روو دەدات ئەگەر زوڵم و سەرکوتکردن هەبێت، بۆی هەیە ئەمە راست بێت، بەڵام هەر مێژووش فێری کردین کە ئاسانکاری و لێبووردەیی لەلایەن دەسەڵاتەکەوە ڕێگەخۆشکەرن بۆ ڕوودان و سەرکەوتنی شۆڕش، لویسی شازدەم لە مەلیکەکانی فەرەنسای سەرکوتکەر بوو، بۆیە شۆڕشی فەرەنسا لە سەردەمی ئەودا رووی دا، شۆڕشی ئۆکتۆبەر سەرکەوت، چونکە حکوومەتی قەیسەری لاواز بوو.

لە عێراقدا، ئەگەر سەرکوتکردنێکی راستەقینە لە ئارادا بوایە ئەوا سەرجەم ئەفسەرانی سوپا دەخرانە ژێر چاودێری و راوەدوو دەنران یان دەخرانە گرتیگە و گوللەباران دەکران، ئەگەر کەمترین گومانیان لێ کرابا وەک لە عێراق دوای ساڵی ١٩٦٨ رووی دا، ١٤ی تەمووز لایەنگری شەقامی بەدەست هێنا ئەمەش لە ئەنجامی کاریگەری راگەیاندنی ئاراستەکراو بوو دژ بەعێراق لە دوای دەستدرێژیی سێقۆڵی بۆ سەر میسر.

هەر شۆڕشێک سەرەتا تێک دەدات و دواییش بنیاتی دەنێتەوە، تێکدان ئاسانە، بەڵام بنیاتنانەوە زەحمەتە، کاتێکی زۆر دەخایەنێت و سەردەکەوێت یان سەرناکەوێت، ئەگەر ئامانجی شۆڕش بەدەستهێنانی دیموکراسییەت بێت وەک زۆربەی شۆڕشەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، دەبینین زۆربەی دیموکراسییەکان لە

ئەنجامی شۆڕشە خوێناوییەکانەوە بەدی نەهاتوون، بگرە لە ئەنجامی پەرەسەندنی ئاشتییانەوە بووە، دیموکراسییەت کاتێک گەشە دەکات ئەگەر ئاسایش و کەشوهەوای دامەزراوەیی بەرقەرار بن، دەڵێن رۆژنامەنووسێک لە جەنەراڵ دیگۆل یان شوان لای پرسیوە: "ئاسەوارە دوورمەوداکانی شۆڕشی فرەنسایی چۆن هەڵدەسەنگێنن؟ وەرامەکەی ئەوە بووە: "جارێ زووە ئەو ئاسەوارە هەڵبسەنگێندرێ".

رۆژانی بەراییی دوای ١٤ی تەمووز روون بووەوە وەک هەموو شۆڕشەکانی مێژوو ئەو شۆڕشەش خۆی دەخواتەوە، ئەمەش لە ئەنجامی ململانێی نێوان هەڵگیرسێنەران بوو، وەک لە شۆڕشی فرەنسایی و شۆڕشی ئۆکتۆبەر روویان دا، ئەمە لە عێراقیش رووی دا، هێشتا مانگێک بەسەر شۆڕشدا تێ نەپەڕیبوو ململانێی نێوان شیوعییەکان و نەتەوەپەرستەکان دەستی پێ کرد، وەک مەزەندەش دەکرا یەکەمین قوربانیی شۆڕش ئەوانە بوون کە سەمایان بۆ دەکرد.

کودێتای ساڵی ١٩٦٣ قەوما، عێراق کەوتە شەوەزەنگ و قێزەونترین تاوان لە کوشتن و ئازاردان و جینۆساید لەو ماوەیەدا روویان دا، تیرۆرێکی ئەوتۆ بەسەر وڵات داهات کە پێشتر بەخۆیەوەی نەبینیبوو، گرتیگەکان تژی بوون لە خەڵک کە کەسانی رووناکبیری عێراقیشی تێدا بوو، مێژووی ئەو ماوەیە بریتییە لە دڕندەترین چیرۆکی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ.

ساڵی ١٩٦٣، فراوانترین هێرشی سەربازی بۆ سەر کوردستان دەستی پێ کرد، گوندەکان بە ناپاڵم بۆردمان کران، هاتوچۆ لە شارە کوردییەکاندا قەدەغە کرا، هەزاران کورد خرانە گرتیگەوە، حکوومەت رای گەیاند مەبەست لەم هەڵمەتە سەربازییە چەسپاندنی یەکەتیی نیشتمانییە، کەچی لە واقیعدا ئەو هێرشە سەربازییانە پارچەکردنی یەکەتیی نیشتمانی بوو.



کۆیه ۱۹٦۳، سەرۆک بارزانی لە ناوەڕاست و مام جەلالیش یەکەم کەس لای ڕاستەوە، لەملاو لەولای سەرۆک بارزانی هەریەک لە فایق سامەرائی، د. عەبدولعەزیز دوری، حوسێن جەمیل، زەید ئەحمەد عوسمان ڕاوەستاون.



لە ڕاستەوە بۆ چەپ: د. عەبدولعەزیز دوری، زەید ئەحمەد عوسمان، شێخ محەمەد ڕەزا ئەلشبیبی، فایق سامەرائی.



وێنەی کوردە دوورخراوەکان بۆ عەین تەمر، ساڵی ١٩٦٦، لەلای ڕاستەوە: لیوای خانەنشین عەبدوڕەحمان موفتی، زەید ئەحمەد عوسمان، عەمید ئەحمەد کەمال قادر، لیوا فوئاد عارف، لیوا عەبدولمەجید عەلی



سەردانێک کە لە بیرەوەریمدا هەردەم بەزیندوویی دەمێنێتەوە، کاتێک ساڵی ١٩٦٧ لە ناوچەی حاجی ئۆمەران سەردانی سەرۆک بارزانیم کرد.

دوای سالانێک لە سەرەڕۆیی توندوتیژی، لە ناوەڕاستی شەستەکانەوە هێوری و میانڕۆیی و لۆجیک وردە وردە بۆ ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیریی عێراق گەڕانەوە، ئەم میانڕۆییە رێژەییە لە گوتاری سیاسی و بەیاننامەکانی حکوومەت و رۆژنامەوانیدا رەنگی دایەوە، عێراقییەکان هەستیان بەوە کرد کە لە کۆتاییی تونێلەکەوە رۆشناییەک دیارە و هیوای ئەوەش لە ئارادایە عەقڵ بۆ ژیانی سیاسی بگەڕێتەوە و ئینجا جۆرێک لە کەشوهەوای لیبراڵی عێراق بگرێتەوە، بوونی عەبدوڕەحمان بەزاز وەک سەرۆک وەزیران لەو گۆڕانکارییانەدا کاریگەری هەبوو.

ساڵی ١٩٦٠ لە کەرکووکەوە بۆ بەغدا گوێزرامەوە تا لە بارەگەی گشتیی کۆمپانیای نەوتی عێراق کار بکەم کە ئەو کاتە کەوتبووە کەڕادە مریەم، لە جادریە دەستم بە دروستکردنی خانوویەک کرد، پارچە زەوییەکم کڕی کە مەتری چوارگۆشەی بە دوو دینار بوو، زەوییەکە کەوتبووە تەنیشت بێستانێکەوە، دارخورماکان بەشەو وا دیاردەکەوتن کە درێژکراوەی باخچەی ماڵەکەن.

لە شەستەکاندا، جادریە شێوازە گوندییەکەی مابوو، دارخورما و پرتەقاڵ و لیمۆ لە هەموو شوێنێک هەبوو، هێشتا پردی جادریە دروست نەکرابوو و رێگە سەرەکییەکان قیرتاو نەکرابوون بۆیە ناوچەکە لە ژاوەژاوی ئۆتۆمۆبێل و قەرەباڵغیی رێبواران دوور بوو، ژمارەی ماڵەکان لە ٢٠-٣٠ ماڵ تێپەڕی نەدەکرد، لە دیمەنە باوەکانی ئەو کاتەی جادریە بینینی ئەسپ سوارەکان بوو لە رێگە خۆڵاوییەکاندا، لەوێ تەویلەیەک هەبوو ئەسپەکانیان تێدا دەبەستایەوە، خاوەن ئەسپەکان عێراقی و بیانی بوون، لەوانە دوکتۆر نەدیم پاچەچیم وەبیر دێت.

عەبدولسەلام عارف فەرمانێکی دەرکرد بە دەستگیرکردنی کوردە ناسراوەکانی بەغدا و نەفیکردنیان بۆ ناحیەی عەین تەمر لە لیوای کەربەلا، لەو دەستگیرکراوانە "فوئاد عارف، رەشید جەودەت، زەیدی برام، عەبدوڕەحمان موفتی، عەبدولفەتاح شالی، مەجید عەلی، ئەحمەد کەمال قادر"، خانەوادەی دەستگیرکراوەکان، هەموو

ڕۆژانی هەینی کۆ دەبوونەوە، پاسێکیان بەکرێ دەگرت تا پێداویستی بۆ دوورخراوەکان ببەن، ڕۆژێکی تەواومان لە عەین تەمر بەسەر دەبرد، خەڵکی ناوچەکە و دەوروبەر ڕوویان زۆر خۆش بوو تەنانەت ژمارەیەک لە سەرۆک هۆزەکان بەردەوام سەردانی دوورخراوەکانیان دەکرد و یارمەتییان دەدان، فوئاد عارف لە ڕۆژگاری عەبدولکەریم قاسم موتەسەڕیفی کەربەلا بوو، توانیبووی پێوەندییەکی باش لەگەڵ خەڵکەکەدا دروست بکات.

دوای مردنی عەبدولسەلام عارف، دوورخراوەکان ئازاد کران، عەبدوڕەحمان بەزاز بانگی زەیدی برامی کرد و نامەیەکی دایێ تا بیگەیەنێتە سەرۆک مستەفا بارزانی، ئەمە دەسپێکی وتووێژ و سەردانی بەردەوام بوو لە نێوان سەرکردایەتیی کورد و حکوومەتی بەغدا، کە بە بەیانی ٢٩ی حوزەیران کۆتایی هات.

ڕۆژنامەی-العرب- کە خاوەنەکەی - نەعمان عانی - بوو لە ژمارەی ڕۆژی ١٩٦٥/١/٢١ ئەم هەواڵەی بڵاو کردەوە.

"مامۆستای پارێزەر زەید ئەحمەد عوسمان نیوەڕۆی دوێنێ خوانێکی فراڤینی لەماڵەکەی خۆی لە "عرصات الهندية" بەبۆنەی هاتنی بەڕێز ئیدریس بارزانی کوڕی مەلا مستەفا بارزانی و شاندە یاوەرەکەی بۆ بەغدا و دیداریان لەگەڵ سەرکۆمار فەریق عەبدوڕەحمان محەمەد عارف ساز کرد، زەید و براکانی زۆر بە لوتفەوە پێشوازیی میوانەکانیان دەکرد و ڕێزیان لێ دەنان، ماڵەکەی مامۆستا زەید ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتییە سیاسییەکان و نیشتمانپەروەرەکان و ئەوانەی لە کاروباری گشتیدا کاریان دەکرد بەخۆوە گرتبوو، لەمانە ئیدریس بارزانی، حەبیب محەمەد کەریم، موحسین دزەیی، نافیز جەلال، ساڵح یوسفی، شەوکەت عەقراوی، عەبدوڕەحمان بەزاز سەرۆک وەزیرانی پێشوو و، باباعەلی شێخ مەحموود، فوئاد عارف، عەلی سنجاری، دوکتۆر عەبدوڕەحمان عەبدوڵڵا، ڕەشید نەجیب، عەلی کەمال، ڕەئووف ئەحمەد، ئیحسان شێرزاد، قەرەنی دۆغرەمەچی، هادی چاوشلی، ئەکرەم جاف، مەسعوود محەمەد، ئەحمەد کەمال، کەریم موراد، جەبار عەزیز، مەهدی سەید موحسین حەکیم، عەلی

شەعلان، عومەر عەلی، حوسێن جەمیل، سادق کەمونە، د. کازم شبر، کازم رەزوان، د. باقر عەبدولغەنی، عەبدولوەهاب ئەلئەمین، خەلیل جەمیل، حاجی نەعمان عانی".

ئاهەنگی فراڤینەکە دوای سەعات ٣ کۆتایی هات، مامۆستا زەید ئەحمەد عوسمان هەلێکی باشی رەخساند تا ئەو خەڵکە دەستەبژێرە، باس لە فرەکێشەی نەتەوایەتی و نیشتمانی و کێشە هەنووکەییەکان بکەن، بەهەمان شێوەی پێشوازیکردن مێوانەکان بەوپەڕی رێزەوە لەلایەن خانەخوێوە بەڕێ کران.

ئێوارەی هەمان رۆژ، مامۆستا فوئاد عارف لە ماڵەکەی خۆی لە شەقامی مەغریب خوانێکی شیوخواردنی لەسەر شەرەفی بەڕێز ئیدریس بارزانی ساز دا، زۆربەی ئەو کەسایەتییانەی کە لە نیوەڕۆخوانەکەی ماڵی بەڕێز زەید ئەحمەد عوسمان ئامادە بوون لە ئێوارەخوانەکەی بەڕێز فوئاد عارفیش ئامادە بوون، جگە لە چەندان کەسایەتیی کورد و عەرەب، باوکی فەرهاد بەوپەڕی رێزەوە مێوانەکانی بەخێر هێنا و لوتفی بەرامبەر دەنواندن، شەو درەنگان مێوانەکان ماڵی مامۆستا فوئاد عارفیان جێ هێشت سوپاسی ئەو رێز و پێشوازییەیان کرد.

ساڵی ١٩٦٨ کامل چادرچی کۆچی دوایی کرد، کاتی بەڕێکردنی جەنازەکەی لە ماڵەکەی خۆیدا لە شەقامی تەها بەرەو گۆڕستانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، هەموو ئەو رێگەیانەی بەرەو گۆڕستانی گەیلانی دەچوون داخران، خەڵک لەمبەر و لەوبەری شەقامی کیفاح کە بەرەو گۆڕستان دەچوو بەکزی و خەمباری راوەستابوون.

بەبۆنەی چلەی چادرچی، لە هۆڵی خولد ئاهەنگێکی ماتەمینی ساز درا، نوێنەری حزبە سیاسییەکانی وڵاتە عەرەبییەکان تێیدا ئامادە بوون لەمانە: کەمال جونبلات، رەفعەت چادرچی وتاری بنەماڵەی خوێندەوە، بە مردنی چادرچی لاپەرەیەک لە مێژووی سیاسیی عێراق پێچرایەوە.

بەغدا، لە ناوەڕاستی شەستەکان راپەڕینێکی رۆشنبیری و هونەریی بەخۆوە بینی و چەندان بواری داهێنانی گرتەوە، بۆ نموونە لە بیناسازیدا نەوەیەکی بیناساز پەیدا بوو کاریگەرییان بەسەر نەوەکانی پاشەڕۆژ لە بیناسازە عێراقییەکانەوە جێ هێشت، جەختیان لەسەر بایەخی کەلەپوور لە بیناسازیی

عێراقیدا کردەوە و بەگرینگیان زانی و دوای کۆکردنەوەی کەلەپوور و تازەگەری و رابردوو و هاوچەرخی و شێوە و ئەرک بەیەکەوە دەکرد، هانی پەرەپێدانی پێوەندیی ئۆرگانیکیان دەدا لە نێوان هونەرمەندی شێوەکار و بیناساز لە کاری بیناسازیدا.

لەو کەشوهەوایەدا، کولتووری بیناسازی لە نێوان ئەو کەسانەشدا پەیدا بوو کە بیناساز نەبوون، رۆشنبیری عێراقی، لەوە دەگەیشت کە "فرانک لوید رایت، گروپیۆس، کوربوازیێ" چ دید و بۆچوون و فەلسەفەیەکیان لە بیناسازیدا هەیە، دیارترین بیناسازی ئەو کاتە رەفعەت چادرچی و دوکتۆر محەمەد مەکیە بوون، ئەو دووانە رابەرایەتیی قوتابخانەی عێراقی بۆ بیناسازییان کرد، ئەو قوتابخانەیەی پشتی بە کەلەپوور و تەکنەلۆجیا و بنەما جیهانییەکان دەبەستا.

رەفعەت چادرچی، پێوەندییەکی پتەوی برادەرایەتی و هاوکاری لەگەڵ جەواد سەلیمدا هەبوو، رەفعەت سەرپەرشتی و سەرکردایەتیی ئەو تیمەی کرد کە "نصب الحریة"یان لە مەیدانی "التحریر" دانا، بەڵام جەواد سەلیم مەرگ بواری نەدا کارە مەزنەکەی بە بەرزکراوەیی لە ناوەندی شاری بەغدادا ببینی.

لە سالانی پەنجا و شەستەکان چەند بیناسازێکی داهێنەر هەڵکەوتن کە تا ئێستا کارە جوانەکانیان لە چەند ناوچەیەکی بەغدادا ماوە، لەمانە: "مەدحەت عەلی مەزلوم، نزار عەلی جەودەت و - ئەلەن-ی هاوسەری، عەبدوڵلا ئیحسان کامیل، قەحتان عەونی، قەحتان مەدفەعی، هیشام مونیر".

دوای گەڕانەوەی فوئادی برا گچکەم لە ئەمەریکا لە سەرەتای شەستەکان، لە بەشی ئەندازەی بیناسازی کۆلێجی ئەندازەی زانکۆی بەغدا دامەزرا، دوکتۆر محەمەد مەکیە سەرۆکایەتیی بەشەکەی دەکرد و چەند مامۆستایەکی بیانیشی تێدابوو کە ئەو شوێنەیان کرد بە وەرشەی کار بۆ چالاکی و داهێنان.

کۆمەڵەی بیناسازە عێراقییەکان، لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٦٦ ژمارە "١"ی کۆواری "النثار"یان دەرکرد، پێرستی ئەو ژمارەیە ئەم وتار و لێتوژینەوانەی بەخۆوە گرتبوو:

١- الخلق وحتمیة الأزمة، جبرا ابراهیم جبرا.

٢- مشكلة الفنون المحلیة، رفعت الجادرجي.

٣- الحركة والقیم المعماریة الجدیدة، قحطان المدفعي.

٤- الحفاظ على موقع نينوى الاثري، تقرير الدكتور محمد مكية.

٥- الفن المعماري في العراق، ١٩٢٠-١٩٤٠ معاذ الالوسي.

٦- ملاحظات عن السينما، محمود عثمان.

٧- الموسيقى عند العراقيين القدماء، لمياء الكيلاني.

٨- دار الكيلاني، تحقيق مصور، سهير الموصلي، سعد الزبيدي، بسام البير، رعد المميز.

ئەمەش دەقی ئەو وتارەیە کە لەو ژمارەیەدا بڵاوم کردەوە:

**چەند تێبینییەک لەبارەی سینەماوە:**

سینەما شێوەی هونەرێکی سەربەخۆی وەرگرت، توانای ئەوەی هەیە کێبەرکێ لەگەڵ شانۆدا بکات بە تایبەتی دوای پەیدابوونی فیلمی وەک: "لەدایکبوونی میللەتێک"ی دبلیوکریفت کە باس لە شەڕی ناوخۆی ئەمەریکا دەکات. هەروەها فیلمەکانی گەورە دەرهێنەری روس "سرج ئیزنشتاین" وەک فیلمی: "پاپۆڕی شەڕی بوتیمکن"، لە سەرەتای سالآنی بیست، بە پەیدابوونی ئەو فیلمانە، گرینگترین پێداویستییەکانی کاری هونەری "رەگەزی درامی" هاتنە ناو سینەماوە، سینەما پشتی بە رۆمان و رووداو و ملمـلانێ و ترۆپکی ئەدەبی بەستا، پەیدابوونی فیلمەکانی "چاپلن، بستەرکیتن، هاری لۆید" ڕەگەزێکی تازەی هێنایە ناو سینەما ئەمیش ئەو توانا زۆرەی کۆمیدیا بوو کە ئەو داهێنراوە تازەیەی دۆزییەوە، بەم جۆرە سینەما وەک بزاڤێکی داهێنەرانەی خاوەن ئاسۆیەکی فراوان خۆی سەپاند.

لە سەرەتاوە، سینەما هەوڵی دەدا ئاستەکەی لە کات بەسەربردنەوە بۆ ئاستی کاری هونەری بەرز بکاتەوە، چەند بنەما و رێسایەکی بەکار دەهێنا کە لە جەوهەردا سەر بەهونەری تر بوون، لە فیلمە تەعبیرییەکەی رۆبەرت وانیا "دۆلابی دوکتۆر کالیگاری" دەرهێنەر تا ڕادەیەکی زۆر پشتی بە سوریالیزم بەستابوو، کە دوای یەکەم شەڕی جیهانی باڵی بەسەر هونەر و ئەدەبدا کێشابوو، لە فیلمی "هێزی پێنجەم"ی لۆرەنس ئولیڤیەدا کە لە کاتی دووەم شەڕی جیهانیدا دەرهێنرا، دەرهێنەر بە تەواوی پشتی بە شانۆ بەستابوو.

## هونەرێکی بێ رابردوو:

ڕەگەزی رابردوو لە هونەری سینەمادا لەناودەچێت، ئەو ڕەگەزە هیچ مێژوو و ڕەگ و نەریتێکی وەک هونەرەکانی تر نییە، لەدایکبووی سەدەی بیستەمە و هەموو شێواز و گیان و کەسایەتییەکی ئەو سەدەیەی لەخۆ گرتووە، لەناوچوونی رابردوو لە سینەمادا لەوە قەدەغەی دەکات کە ببێتە هونەرێکی تازە بە مانا زاراوەییەکەی، هونەری تازە بە نیسبەت قوتابخانە هونەرییەکانی پێش خۆی شتێکی نوێ بوو، بۆ نموونە شانۆی ناماقوول تازە بوو، چونکە دەتوانرێ بەراورد بکرێ لەگەڵ شانۆی کۆن و شانۆی چەرخی نۆزدەم و شانۆی کۆمیدی (دلارتە) لە چەرخی حەڤدەم و شانۆی ئەلیزابێسی لە چەرخی شازدەم.

ئەبستراکت لە وێنەکێشاندا بەشێکە لە بزاڤی هونەری تازە، بزاڤێکە دەتوانین لەگەڵ وێنەی ئەشکەوتەکان و بیزەنتی و سەردەمی ڕاپەڕین و وێنەی ئیمپریۆشیسنیزمەکان بەراوردی بکەین، دەتوانین هەمان شتیش لەبارەی ئەدەب و هونەرەکانی ترەوە بڵێین.

سینەما لە پێکهاتەیدا دەگمەنە، هونەرێکی هاوچەرخە نەک تازە، بەڵام نەمانی پێوەست لەگەڵ رابردوو و نەمانی بنەما و ڕێسا و نەریتەکانی پێشتر ئازادییەک دەدات بە دەرهێنەری سینەما کە ئەدیب و وێنەکێش نایزانێت، هەستکردن بەخۆ، کە لە توانادا هەیە ئازادیی هونەرمەند سنووردار بکات ئەوا دەرهێنەری سینەما هەستی پێ ناکات، نەمانی رابردوو وای لە سینەما کردووە ببێتە هونەرێک کە بوارێکی تەعبیری فرەی تێدابێت.

## سینەماییەت لە سینەمادا:

سینەما هونەری وێنە جووڵاوەکانە، ئێمە دەبینین کە دایەلۆگ بنەمای شانۆیە، لە هەمان کاتدا وێنەی جووڵاو بنەمای سینەمایە، سەیر نییە کە بانگەشەکارانی سینەما، سینەمای راستەقینە لە فیلمە بێدەنگەکاندا دەبینن، بە مردنی فیلمی بێدەنگ ڕەگەزێکی گرینگ لە ڕەگەزەکانی سینەماییەت مرد، ئەو پێشوازییە گەرمەی کە لە فیلمی " مسیۆ لو لە پشوودا"ی - جاک تات-ی کرا، لەو شاکارەدا دایەلۆگ بە تەواوی نامێنێت، بەڵام ڕەگەزەکانی ڕۆمان و ڕووداو و وروژاندن

کاریگەرییان بەسەر نەمانی وشەدا نابێت، لێرەدا جەخت لەسەر وێنەی جووڵاو یان سینەماییەت دەکرێتەوە، جەختکردنیش لەسەر سینەماییەت، کە لەم ساڵانەی دواییدا بایەخی کامێرامانی زیاد کرد، ڕێگەی وێنەگرتنی فیلم هەندێک جار باڵ بەسەر سیماکانی فیلمی تردا دەکێشێت، فیلمی "سەرسامی" کە بەم دواییانە لە بەغدا پێشکێش کرا بە هونەری لەقتەکانی، جەماوەری سەرسام کرد، وێنەگرتن هەموو شتێکی لە بیر بردینەوە، ئەو گۆشە لێزانەهاتووانەی کە کامێرا هەڵی بژاردبوون هەیبەتی شاعیریەتی داوە بە شاشە، لەو فیلمانەی کە لە بەغدا پێشان دەدران ئەوەمان نەبینیبوو.

**سینەما لە بەغدا:**

تا ئێستا لە بەغدا فیلمەکانی گەورە دەرهێنەرانی وەک "کیراساوا، ئەنگمار برگمان، تونی ریچاردسون، تروفو کودارد" پێشان نەدراون، تاکە جارێک فیلمی "ژیانی شیرین" پێشکێش کرا، بەڵام لێی پچڕێندرابوو، فیلمە ناوادارەکەی فسکونتی "پڵنگ" نیوەی پچڕێندرابوو تەنیا لەبەرئەوەی فیلمێکی درێژ بوو.

سەرەڕای ئەمانە، ساڵی ١٩٦٥ سێ فیلمی ناودار لە بەغدا پێشکێش کران، "هاملێت"ی دەرهێنەری رووسیایی کوسنسیف، "یاداشتی خزمەتکارێک"ی دەرهێنەری ئیسپانیایی بونویل، "زۆربای یۆنانی" دەرهێنەری یۆنانی کوکایانس.

**هاملێت:**

لە فیلمە شکسپیرییە ناودارەکان، هەردوو فیلمی "هێنری پێنجەم" و "هاملێت" لە نواندن و دەرهێنانی "لۆرەنس ئۆلیڤیە" لە ریزی پێشەوە دێن، فیلمی یەکەم لە کاتی دووەم شەڕی جیهانی دەرهێنرا و فیلمی دووەمیش لە ساڵانی پەنجاکاندا، فیلمی "هاملێت ی دەرهێنەری رووسیایی "کوسنسیف" کە بەم دواییانە لە بەغدا هاتە پێشاندان هیچی کەمتر نەبوو لە کارەکانی لۆرەنس ئۆلیڤیە، کوسنسیف ئەو دەقەی هەڵی بژاردبوو کە باسترناک وەری گێرابوو، شتێکی ئاساییە نێزیکبوونەوەیەک لە نێوانی دانەری "دوکتۆر ژیڤاگۆ" و "هاملێت"ی تەنیا و سەرسوڕماو و گومانکاردا ببینین.

کوسنسیف ڕووداوەکانی پوخت نەکردبووەوە، ئەمە وای لە ڕەخنەگرەکان کرد

فیلمەکە کە بە ئەکادیمیەت لە قەڵەم بدەن، لە راستیدا گەورەیی فیلمەکە لەوەدایە کە پێوەستێکی پتەو لە نێوان هەر بەش و دیمەن و جووڵەیەکدا هەیە، وادیارە دەرهێنەر تۆژینەوەیەکی قووڵی تەنانەت بۆ دیمەنێکی کەم بایەخیش کردووە، هەر گرتەیەک وەک بڵێی بە ئانقەست بووە وەک هەڵبژاردنی شوێن و جۆری ئەو قەڵایەی کە رووداوەکەی تێدا قەوماوە و ئەو قەرەباڵغییەی لە دیمەنی دواوەدا دیاردەکەوێت، یاخۆ دیداری هاملێت و ئۆلیڤیا بۆ یەکەم جار لەسەر پێپلیکانەکان، زۆر بەدەگمەن پێشەکیی بەهێزی وەک پێشەکیی ئەو فیلمەمان بەرچاو دەکەوێت، ئەو کاتە، هاملێت دوای مردنی باوکی دەگەڕێتەوە قەڵا، دایکی بە هەڵەداوان دەیەوێت باوەشی پێدا بکات.

کەشوهەوای چەرخەکانی ناوەند لەناو قەڵا و جلوبەرگی ئەکتەرەکان هەر گرتەیەکیان کردبوو بە وێنەیەک لە وێنەکانی سەردەمی رێنیسانس.

**توندوتیژی:**

کۆتایی فیلمی "بیرەوەرییەکانی خزمەتکارێک"ی لویس بونویل کەمتر نییە لە سەرەتای فیلمی هاملێت، لە دوا گرتەی فیلمەکەی بونویلدا، خۆپێشاندەرە فاشیستەکان بەشێوەیەکی تۆقێنەر و پێکەنیناوی رادەکەن تا لە بەرچاو بزر دەبن، بونویل "گۆیا"ی ئەو سەردەمەیە و نە بەزەیی هەیە و نە سەوداش دەکات، بونویل لە فیلمەکانیدا پەیامێکی هەیە ئەمیش ئەمەیە کە توندوتیژی و دڕندەیی ڕەگەزی مرۆڤیان کۆنترۆڵ کردووە.

فیلمی "بیرەوەرییەکانی خزمەتکارێک"، تۆژینەوەیەکی ترە لەبارەی توندوتیژییەوە کە بونویل خستوویەتییە سەر تۆژینەوەکانی تری، رووداوەکانی فیلمەکە باس لە خانەوادەی "لانلیر"ی مامناوەند دەکەن، "سلستین"ی پاڵەوانی فیلمەکە رۆڵی خزمەتکار دەبینێ لە فیلمەکە کە لە رۆمانی بەناوبانگی "ئۆکتاف میربا" وەرگیراوە و باس لە ژیانی چینی مامناوەندی فەرەنسایی بەر لە داگیرکردنی فاشییەتدا دەکات، رووداوەکان لە ماڵێکی گەورە دێیەکدا دەست پێ دەکەن، خانەوادەی "لانلیر" کە "سلستین" خزمەتکاریانە وێنەیەکە بۆ دەمارگیریی دەبەنگی و داڕمان، "جۆزیف"ی خزمەتکار کە رۆڵێکی گرینگی لە فیلمەکەدا هەیە وێنای شەڕ و توندوتیژی دەکات، بەڵام خێر و بێکوناهی منداڵە بچووکەکە وێنایان دەکات،

منداڵەکـە دوای ئەوەی لە دارسـتـانێکدا دەسـتـدرێژیی دەکـەنە سـەری پاشـان دەیکوژن.

**مردن و ئازادی:**

فـیلمی "زۆربای یۆنانی" لە دەرهێنانی دەرهێنەری یۆنانی "کـوکـایانس" سترانێکی خەمبارە لەبارەی مردن و ئازادییەوە، بەهەموو مانایەکی راستی وشەی ئەدەب فیلمێکی ئەدەبییە، فیلمەکە لە رۆمانی "ئەلکسیس زۆربا" وەرگیراوە کە "نیکۆس کازانتزاکی" دوای دووەم شەڕی جیهانی نووسیویەتی، بابەتی رۆمانەکە بنەمای کارە ئەدەبییەکانی ژمارەیەک نووسەری فەرەنسایییە لەو ماوەیەدا کە ئەمیش بابەتی "بێهوودەیی"یە، زۆربا کەسایەتییەکی وجوودییە، پێوەست نییە بە هیچ شوێن و کاتێکەوە، تەنیا بۆ سەما دەژی و سەماش هێمای ئازادییە لای یۆنانییە کۆنەکان.

رووداوەکانی رۆمانەکە لە دوورگەی "کریت"ە، "لاسالی" وێنەگر لە تۆمارکردنی دیمەنەکان و دەموچاوەکاندا داهێنانی کردووە، ئەو وێنانە لە خەیاڵی ئێمەدا هەر زیندوون، لە ئەنجامی وێنەگرتنی ئەو فیلمەدا لاسالی خەڵاتی ئۆسکاری وەرگرت، چیرۆکەکە باس لە لاوێکی ئینگلیزی بە ئەسڵ یۆنانی دەکات، ئەو لاوە لەگەڵ خزمەتکارێکی نامۆ کە ناوی "زۆربا"یە و لە رێگە تووشی بووە دێنە دوورگەی کریت، لاوەکە بە مەبەستی بەگەڕخستنی کانگەیەک هاتووەتە کریت کە بە میرات بۆی ماوەتەوە، بەڵام خزمەتکارەکە بەڵێنی پێ دەدا کە زەوییەکە بەکار بهێنێت ئەمیش بە دروستکردنی پێپلیکانەیەکی گەورە بۆ گواستنەوەی دار، لاوە ئینگلیزییەکە و خزمەتکارەکە ناسیاوی لەگەڵ بێوەژنێک پەیدا دەکەن کە ئافرەتێکی جوان و هێمای گەورەیی و خێر بوو، بەڵام لەبەر بوونی پێوەندی لەگەڵ لاوەکە بەوپەڕی درندەیی دەکوژرێت.

لە کۆتاییدا، ئەو پێپلیکانەیەی کە زۆربا دروستی کردبوو دەڕووخێ، لاوە ئینگلیزەکە نەپێکانی نامانجەکەی و بێهوودەیی ژیان دەدۆزێتەوە، ئاوڕ لە زۆربا دەداتەوە و دەڵێت:

- فێرم بکە وەک تۆ سەما بکەم، با بەتەمای هیچ شتێکی تر نەبین.

سالانی شەستەکان، عێراق ڕاپەڕینێکی لە بوارێکی تری داهێنانەوە بەخۆوە بینی، وەک چۆن سالانی پەنجاکان ماوەی پالەوانێتیی شیعری نوێ و هونەری شێوەکاری بوو لە عێراق، ئە ئاواش سالانی شەستەکان ماوەی پالەوانێتیی شانۆی عێراقی بوو، لەو ماوەیەدا چەندان شانۆگەریمان بینی بە تەکنیکی بەرز و قوول لە لێکدانەوە و هەستدا، سەرەڕای ئەوەش تواناکان سنووردار بوون و بارودۆخەکەش قورس بوو، لەو شانۆگەریانە "دارخورما و دراوسێ"ی توعمە فرمان و "بووکەشووشە"ی تنسی ولیامز و "مەسیح سەرلەنوێ لە خاچ دەدرێتەوە"ی کازانتزاکی.

لەو ماوەیەدا، داهێنەرەکانی شانۆگەری لە عێراق، دەرهێنەران و ئەکتەرانی وەک "یوسف ئەلعانی، سامی عەبدولحەمید، قاسم محەمەد، عەونی کەڕومی، خەلیل شەوقی، زەینەب، ناهیدە ئەلڕەماح و هی تر" پەرەسەندنەکانی شانۆی جیهانیان بە جەماوەری عێراقی ناساند.

شانۆ بچکۆلەکەی بەغدا، کەوتبووە لقە جادەیەکی پشت سینەما نەسر، بووبووە مینبەرێک، عێراقییەکان هەموو شەو بە هەڵەداوان روویان تێ دەکرد تا سیحری شانۆی داستانی بدۆزنەوە و بزانن شانۆی تەعبیری و ئەبستراکت چییە، بە سەرسامی بەرامبەر کارەکانی بریخت رادەوەستان لە سالانی شەستەکاندا، بزاڤێکی شانۆگەری لە دەرەوەی چوارچێوەی دەولەتدا سەری هەلدا، کۆمەلە رۆشنبیرێکی عێراقی ئارەزوومەند، دوای ئەوەی خوێندنیان لە بەریتانیا تەواو کرد گەڕانەوە عێراق، ئەوانە پزیشک و ئەندازیار و بیناساز و ئابووریناس و نووسەریان تێدابوو، هەفتانە دیداریان بۆ گوێگرتن لە موزیکی کلاسیک ساز دەدا و ناو بەناویش لە مالەکانی خۆیاندا کۆڕی فیکریان دەگێڕا، شانۆ پانتاییەکی دیاری لە بایەخ پێدانی ئەوان داگیر کردبوو، سوهام سائیب شەوکەت یەکێک لە ئەندامە دیارەکانی ئەو کۆمەلەیە، بایەخ پێدانەکانی کرد بەئەزموونێکی کردار، ئەو کاتەی لە زانکۆی کامبردج دەیخوێند بەشداریی لە چەندان کاری شانۆییدا کرد، کە گەڕایەوە عێراقیش بە جۆش و خرۆشەوە شانۆی جیدی گواستەوە بەغدا، پەرەسەندنی هونەری درامای رۆژئاوای بە جەماوەر ئاشنا کرد.

ئەو کۆمەلەیە، بارەگەی مانگی سوور کە ئەو کاتە کەوتبووە ناوچەی عەلەویەی

بەغدا کرد بە بارەگە و شانۆیەکی بچووکیان دامەزراند، سەرۆکی کۆمەڵەکە خاتوو سوعاد رازی هاوبەشی کۆمەڵەی خۆشەویستانی شانۆی کرد تا خەونەکانیان بێتە دی، لەو کارەدا کیژەکەی خاتوو سوعاد کە ناوی دوکتۆرە سەلما رازی بوو هەروەها هونەرمەند تەها رازی زۆر هاوکارییان کرد، سەلما پاشان بوو بە مامۆستا لە زانکۆی کۆڵۆمبیا، هەروەها خاتوو دوکتۆرە سانیحە ئەمین زەکی مامۆستای کۆلێجی پزیشکی لە زانکۆی بەغدا، شاکارە بەرزەکانی شانۆی جیهانی وەرگێڕایە سەر شێوەزاری عێراقی، سوهام شەوکەت لەو ئەزموونە پێشەنگەدا بەشداریی کرد.

جەبرا ئیبراهیم جەبرا، لە لایەنگرانی ئەو کۆمەڵەیە بوو، لە دیدارەکاندا بەشداریی دەکردن، لە کاری پرۆڤەی دەرهێنەرە گەورەکانی وەک ئیبراهیم جەلال و سامی عەبدولحەمید و خاتوو "نضال الاشقر"ی لبنانی ئامادە دەبوو، دوای سەرکەوتنە بەراییەکانی نواندنە شانۆییەکانی کۆمەڵەی مانگی سوور، دامەزراوی کۆڵبەنکیان ئامێری پێشکەوتووی رووناکییان دا بە کۆمەڵەکە، بەمجۆرە خەونی کۆمەڵەکە هاتە دی، بوونە خاوەنی شانۆ و جەماوەر.

کۆمەڵەی مانگی سوور بۆ شانۆ، شاکارە بەرزەکانی شانۆی جیهانیان وەرگێڕایە سەر شێوەزاری عێراقی و پێشکێشیان کرد، لەمانە شانۆگەریی "هیدرا کابلر"ی ئەپسن، "بجمالیۆن"ی برناردشۆ، "زانایانی سروشت"ی دۆرنمانت، "خزمەتکاری دوو گەوران"ی کۆلدونی، "بەتووڕەیی ئاوڕ لە رابردوو بدەوە"ی جۆن ئۆزبۆرن.

هەر لەو ماوەیەدا، بەدەستپێشخەریی رەفعەت چادرچی لە سلێخ "کۆمەڵەی بەغدا" دامەزرا، کۆنەماڵەکەی "حیکمەت سلێمان" بە باخچە جوانەکەیەوە بوو بە بارەگەی کۆمەڵە، دەستەی دامەزرێنەر پێکهاتبوون لە "رەفعەت چادرچی، دوکتۆر محەمەد مەکیە، دوکتۆر سالم دەملوەچی، ئەمین عەبدولکەریم، سیهام سائیب شەوکەت، دوکتۆر خالید قەساب، مەدحەت حاجی سەری، محەمەد مەخزومی، قەحتان عەبدوڵڵا عەونی، نزار عەلی جەودەت، محەمەد سەلیم رازی، محەمەد عەبدولوەهاب".

ئەندامانی کۆمەڵە دوو جۆر بوون، جۆری أ: مافی دەنگدان و هەڵبژاردنی

دەستەی کارگێڕی و داڕشتنی سیاسەتی کۆمەڵیان هەبوو، جۆری ب: مافی دەنگدانیان نەبوو، جۆری أ: جگە لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر ئەمانەش تێیدا ئەندام بوون "دوکتۆر خەلیل ئالوسی، فەیسەڵ دەملوەچی، جەبرا ئیبراهیم جەبرا، دوکتۆر عەلی کەمال، مەعاز ئالوسی، سوعاد رازی، دوکتۆرە لەمعان ئەمین زەکی، دوکتۆرە سانیحە ئەمین زەکی، قەحتان مەدفەعی، مەحموود عوسمان، محەمەد غەنی حیکمەت، هیشام مەدفەعی، ئیسماعیل شێخلی، ئەمین رەئووف ئەلئەمین، غەسان رەئووف، یاسر حیکمەت عەبدولەجید، ئەمەل خزەیری، لەمعان ئەلبەکری، مونزیر مونیر عەباس، فەخری خەلیل، نیرە مونیر عەباس"، بەڵام لە راستیدا رەفعەت چادرچی دامەزرێنەری راستەقینە و عەقڵی بزوێنەر بوو.

کۆمەڵەی بەغدا، ئەزموونێکی پێشەنگ بوو لە عێراقدا، تەنیا یانەیەکی کۆمەلایەتی و دامەزراوێکی رۆشنبیری نەبوو، بگرە هەموو شتێکی کۆ کردبووەوە، لە کۆمەڵەدا و بۆ یەکەم جار شاکارە سینەماییە جیهانییەکان پێشان دران، لەمانە فیلمەکانی "ڤسکونتی، فللینی، کراسوا، برگمان، جان رینوار"، جارجار ئاهەنگی گوێگرتن لە موزیک ساز دەدرا وەک چوارینە ژێیەکانی "هایدن، موزارت، بیتهۆڤن"، هەروەها بەغدادییەکان لەوێ گوێیان لە مەقاماتی عێراقی دەگرت و عەلی وەردیش چەندان کۆڕی ساز دا.

ئەمە دەقی یەکێک لە نووسراوەکانی دەستەی کارگێڕیی کۆمەڵەکەیە:

کۆمەڵەی بەغدادیە

١٩٦٧/١١/١٦

بەڕێز

پاش سڵاو...

کۆمەڵەی بەغدادیە، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی پشتی بەلێژنە هەمەجۆرەکانی بەستووە، چەندان چالاکیی رۆشنبیری و هونەری و کۆمەلایەتی نواندووە، لەو ماوە کورتەدا شانازی بەمەوە دەکات، بۆ ئەوەی ئەو چالاکییانە بەردەوام بن و باشتر بن کۆمەڵە داوا دەکات هەر ئەندامێک بوارێک بدۆزێتەوە تا بەشداریی تێدا بکات، کۆمەڵە

مکوڕە لەسەر سوود وەرگرتن لە کاری ئەندامانی بەگوێرەی حەز و ئارەزووەکانیان و هەموو کاتێکیش لەبارەی ئەو بابەتە وە بیروڕایان وەردەگرێت، بۆیە ئەگەر مگێزت هەیە و لە خۆت ڕادەبینی داواکارین لە کۆبوونەوەی لیژنەدا بەشداری بکەیت تا بزانین کام لیژنە هەڵدەبژێریت، کات و وادەش بەگوێرەی ئەم خشتانەیە و زۆر سوپاست دەکەین.

جێگری سەرۆک

١- لێژنەی رۆشنبیری و کەلەپوور
بڕیاردەری لێژنە: بەڕێز فەیسەڵ دەمەلوەجی
نوێنەری دەستەی کارگێڕی: دوکتۆر محەمەد مەکیە
کاتی کۆبوونەوە: چوارشەم ٦ کانوونی یەکەمی ١٩٦٧، سەعات ٨,٣٠ پاش نیوەڕۆ.

٢- لێژنەی یانە:
بڕیاردەری لێژنە: خاتوو لەمعان ئەلبەکری
نوێنەری دەستەی کارگێڕی: بەڕێز محەمەد ئەلرازی
کاتی کۆبوونەوە: دووشەم ١١ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٧، سەعات ٨,٣٠، پاش نیوەڕۆ.

٣- لێژنەی هونەری شێوەکاری:
بڕیاردەری لێژنە: بەڕێز ئیسماعیل شێخلی
کاتی کۆبوونەوە: چوارشەم ١٣ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٧، سەعات ٨,٣٠ پاش نیوەڕۆ.

٤- لێژنەی سینەما:
بڕیاردەری لێژنە: بەڕێز مەحموود عوسمان
نوێنەری دەستەی کارگێڕی: بەڕێز رەفعەت چادرچی
کاتی کۆبوونەوە: یەکشەم ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٧، سەعات

٨,٣٠ی پاش نیوەڕۆ.

٥- لێژنەی مۆسیقا

بڕیاردەری لێژنە: بەڕێز نائیل سمحیری

نوێنەری دەستەی کارگێڕی: دوکتۆر خالید قەساب

کاتی کۆبوونەوە: ٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٧، سەعات ٨,٣٠ی پاش نیوەڕۆ.

لەسەر شانۆی کۆمەڵەی بەغدادیە، عێراقییەکان شاکارە نایابەکانی شانۆگەری جیهانیان بینی، سامی عەبدولحەمید شانۆگەریی "قوتابخانەی ئابڕووچوون"ی - شریدان-ی دەرهێنا، ئەکتەرە ژن و پیاوەکانی کۆمەڵەی مانگی سوور بۆ شانۆ بەشدارییان تێدا کرد، هەروەها شانۆگەریی "لە چاوەڕوانی مردن"ی- جان جینیە و شانۆگەریی "لە چاوەڕوانی گۆدۆ"ی - بیکیت-یشی دەرهێنا، کە جەبرا ئیبراهیم جەبرا کردبووی بە عەرەبی، بەم بۆنەیەوە دەقی ئەو وتارە لەبارەی شانۆگەریی "لە چاوەڕوانی گۆدۆ" دا بڵاو دەکەمەوە کە پێشتر لە نیسانی ساڵی ١٩٦٧ لە کۆواری- العاملون في النفط-دا بڵاوم کردەوە، کۆواری ناوبراو سەکۆی نووسەران و ئەدیبانی نەوەی شەستەکان بوو، جەبرا ئیبراهیم جەبرا سەرپەرشتیی دەکرد و سەرنووسیارەکەشی فەخری خەلیل بوو.

## لە چاوەڕوانی گۆدۆدا

"مرۆڤ لە ژیاندا، کاتێک دەگاتە پلەیەکی دیاریکراو لە لێبینی دەست بە قسەی قۆڕ و بێ کەڵک دەکات و ڕانەوەشی بۆ نییە"

سمۆئیل بیکیت

کۆمەڵەی بەغدادیە، لە نیوەی مانگی رابردوو "ئاداری ١٩٦٧" شانۆگەریی "لە چاوەڕوانی گۆدۆ"ی پێشکێش کرد، ئەو شانۆگەرییە سمۆئیل بیکیت- نووسیویەتی و جەبرا ئیبراهیم جەبرا کردوویەتی بە عەرەبی و سامی عەبدولحەمیدیش دەری

هێناوه، هەردوو پاڵەوانی شـانۆگـەرییـەکـە دوو کـەسی لاتن، یەکـەمـیـان ناوی "ڤـلادیمیـر" و دووەمـیـشـیـان ناوی "ئەسـتـراگـۆن"ە، پەردە لەسـەر هەردوو لاتەکـە لادەدرێت کـە لەژێر دارێکی رووتـەندا چاوەڕێ دەکـەن، داوایان لێ کـراوە کـە چاوەڕوانـی "گـۆدۆ" بکەن، بەڵام هیچ کـامـێکیـان گـۆدۆ نـاناسن، ئەوەی دەیزانن دەبێت لە چاوەڕێکردن بەردەوام بن، لەو چاوەڕوانییـە کـوشندەیەدا، جگە لە قـسـە هیچی تر نییە بیکەن، لە قسەکردن ناوەستن.

دایەلۆگی نێوان ئەو دوو لاتە وەک ئەوە وایە مرۆڤ خۆی لە قسەی یەکێک بگرێت کە لەسـەر کورسیی چێشتـخانەیەک دانیشتووە، قسـەکانیـان وەک ڕەخنەگر- کنپ تانیـان- وەسـفی دەکات نیـمچـە گەیشـتـووە، بەڵام لەو دایەلۆگە نامـاقـووڵەدا بینەر دەتوانێت درک بەو بیرۆکە کابووسییـە بکات کـە دانەر دەیەوێت جەمـاوەر هەسـتی پێ بکات ئەمیش ئەوەیە کاروباری ژیان وەستاوەتە سەر مرۆڤ:

واقیع لە کوێیە و خەیاڵ لە کوێیـە؟ ڕابردوو، ئێستا، داهاتوو لە کوێن؟ مانایەکی ڕیزبەند لە نێوانیاندا هەیە؟ ئەو دوو لاتە دەزانن چییان لەم ژیانە دەوێت؟

"بۆزۆ" بەتەواوی دەزانێت چی لەم ژیانە دەوێت، کـەواتە ئـامـانجـێکی هـەیە، کەسێکی خوێنڕێژە و کۆیلەیەکیشـی هەیە، کەواتە ژیانەکەی مـانایەکی هەیە وەک چۆن لە بەشی یەکەمی شانۆگەرییەکەدا ئەمە وێنا دەکەین، ئەمە لەسـەر "لکی"یش پراکتیک دەکرێت، کۆیلەیەکی چەوسێندراوە، بۆیە دەزانێت چۆن هەڵوێست لە ژیان وەردەگرێت، پاشـانیش کە "بۆزۆ" دەزانێت ئامـانجـەکـە هەڵخـەڵەتاندنە و چاوی لە دەست داوە سـەرەڕای ئەمـەش پێـوەندیی نێـوان "گـەورە و کـۆیلە" (کـە یەکـێکیـان نابینا و ئەوی تریش کەڕە) ژیان بۆ هەردووکیان شیمانەی تێدایە، بەڵام بەنیسبەت هەردوو لاتەکەوە ژیان هەر بە بێزاری دەمێنێتـەوە، ئەوەش کە ڕێگرە لەوەی خـۆیان بکوژن ئەو "هـیـوا" پڕ لە دوودڵیـیەی نێـوانیـانە کـە سەرابە، سـەرابێک کە کـەسی پێنجەمی شانۆگەرییەکە "منداڵەکە" لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت.

بۆ یـەکـەم جـار کـە ئەو شـانۆگـەرییـە لەسـەر شـانۆی هونەرەکـان لە لەندەن پێشکێش کـرا، دەرهێنەر جـەخـتی لەسـەر لایەنی تراجـیـدیی شـانۆگـەرییـەکـە کـردبووەوە، بـەڵام کـە لەسـەر شـانـۆی "کـریـتـریـۆن" سـاڵی ١٩٥٦ پێـشکێش کـرا شـانۆگـەرییـەکە بەشـێـوەی گـاڵتـەجـاڕی و سـوریالـی خـۆی دەنـواند، لە بەرهەمـە

نایابەکەی "کۆمەڵەی بەغدادیە" دەرهێنەر سامی عەبدولحەمید توانیبووی لایەنی تراجیدی و گاڵتەجاڕی زۆر سەرکەوتووانە بەیەکەوە گرێ بدات، گاڵتەجاڕییەکە "شاپلنی" بوو، بەڵام شانۆگەرییەکە هەرچەند بە پێکەنینیشی دەهێنایین، بەڵام خەمبار بوو هەوڵ و کۆششی جەبرا ئیبراهیم جەبرا لە وەرگێڕانی شانۆگەرییەکە بۆ سەر شێوەزاری عێراقی بەری گرت.

سامی عەبدولحەمیدی دەرهێنەر ئەنجامی شەوێک بوو کە لە مێژووی شانۆگەریی عێراقیدا لە بیر ناکرێت، وەک جەبرا ئیبراهیم جەبرا دەڵێت: "شانۆگەریی ناماقووڵ بەری بەیەکگەیشتنی وجوودیەت و سوریالییەتە"، کاتێک هەردوو لاتەکە کێشەی وجوودییەت - کێشەی ئەو نیگەرانییەی کە سەرپەرشتیی بێزاری دەکات - بەرجەستە دەکەن دەبینین ئەو بەشەی "بۆزۆ و لکی" وێنای کابووسە سوریالییەکەیان دەکەن، ئەو بەیەکگەیشتنە چاوەڕواننەکراوەی نێوان رووداو و کاریگەری لە دەروونادا کتوپڕ هەڵوێستەکە بەرەو لوغز دەبات و هەوڵ دەدەین قووڵاییی دەروونیان بپێوین و ئینجا درک بەوە دەکەین کە بارودۆخەکە بەو ڕادەیە ناماقووڵ نییە وەک مەزندەمان دەکرد، لێرەوە هەست بە ناواخنی تراجیدیی شانۆگەرییەکە دەکەین.

نواندنەکە زۆر نایاب بوو، هەردوو لات "سامی سەراج و سادق عەلی شاهین" بە خەمەکان و گاڵتەجاڕییەکانیان دەروونیان داگرتین، هاشم سامەرائی کە رۆڵی "لکی" دەبینی قورسترین رۆڵ بوو و هیچی کەمتر نەبوو لە هەر "لکی"یەکی تر لەسەر شانۆیەکانی جیهان، ئەو رۆڵەی هەرگیز لە بیری ناکەم "بۆزۆ" بوو، رۆمیۆ یوسف بەتەواوی ئەو رۆڵەی بینی، لە ملهوڕی و لە رووخانەکەیدا زۆر نایاب بوو، "عەونی کەرومی"یش لە رۆڵی منداڵەکەدا زۆر نایاب بوو.

مەحموود عوسمان

نیسان ١٩٦٧

لە شەستەکاندا، هەریەک لە "سەعید عەلی مەزلووم" و "هنری زڤوبدا" یەکەم گەلەریان بۆ هونەری شێوەکاری بەناونیشانی "گەلەری واسطی" دامەزراند و "زیاء ئەلعەزاوی" بەڕێوەی دەبرد، زیاء لە دامەزرێنەرانی بزاڤی دیدی تازە بوو، کە جگە لە زیاء عەزاوی هەریەک لە رافیع ئەلناسری و ساڵح جەمیعی و هاشم سەمەرجی

و محەمەد مەهرەدین و ئیسماعیل تورک تیایدا بوون.

ئەو بزاڤە هونەرییە، لە گرینگترین بزاڤەکانی سالآنی شەست بوو، ئەو پێشانگە بە کۆمەڵەی کە دامەزرێنەرانی ئەو بزاڤە پێشکێشیان کرد گەورەترین هەرای نایەوە، تابلۆ جوانەکانیان دیدی تازە و هەستێکی جیاواز لە ڕەنگی تێدا بوو کە ئەبستراکت و ئیکسپریشیۆنیزمی بەیەکەوە کۆ کردبووەوە، سەرجەم ئەو هونەرمەندانە تەمەنیان نەگەیشتبووە سی ساڵ، پێشانگەکەیانم لە بیرە کە لە کۆمەڵەی هونەرمەندە شێوەکارەکان لە مەنسوور کردیانەوە، بەڕاستی سەرسوڕهێنەر و نایاب بوو.

لە بیرەوەرییە جوانەکانی شەستەکان، ئێوارەخوانێکی خانەوادەی فارعە زەهاوی بوو لە سلێخ بەبۆنەی مارەکردنی، نازم غەزالی و سەلیمە موارد گۆرانییان وت، لە بیرەوەرییە خەماوییەکانی شەستەکانیش ئەوە بوو ناسر حەیدەری بردمیە لای "سەدیقە مولایە"، سەدیقە لە ژوورێکی وێرانی کۆڵانێکی باروودیەدا جێنشین بوو، لەسەر کەچە رایەخێک دانیشتبوو، نیمچە نابینا بوو و بەزەحمەت قسەی دەکرد، ئەمە پێش کۆچی دوایی سەدیقە بوو بە ماوەیەک، قەت ناتوانم سەردانەکە لە بیر خۆم بەرمەوە، دوا ڕۆژانی ژیانی مەزنترین دەنگی ئافرەتانەی عێراقم بەو شێوەیە بینی.

شەستەکان، ماوەی داهێنان بوو لە فرە بواردا، هاوولآتییانی عێراق توانییان لە شاشەی تەلەڤزیۆنەوە چەند بەرنامەیەک ببینن کە لە بنەڕەتدا گاڵتەجاڕی بوو، بەلآم لایەنی مرۆیی و شاعیریەتی تێدا بوو، یەک لەو بەرنامانە زنجیرەی "لەژێر گوێزانی سەرتاش" بوو، عێراقییەکان بە جۆش و خرۆشەوە سەیریان دەکرد، عەبوسی و مامۆستا سەرتاشەکەی جەماوەرێکی زۆریان هەبوو، یەکێکی تر لە زنجیرە تەلەڤزیۆنییەکان بینەرانی ورووژاند و کەسایەتییەکە لایەنی مرۆیی و واقیعییەتێکی تێدابوو زنجیرەی عەرز و حاڵچی بوو و ڕەزا شاتی ئەو ڕۆڵەی بینی، هەر لە بەرنامە جوانەکانی تەلەڤزیۆن کە لە سالآنی شەستەکان جەماوەرێکی زۆری هەبوو بەرنامەی "وەرزش لە هەفتەیەک"دا بوو، ئەو بەرنامەیەی عێراقییەکان هەموو ڕۆژێکی سێشەمووان چاوەڕێیان دەکرد و دەیانویست بزانن موئەیەد بەدری بەدەنگە خۆشەکەی چ دەڵێت. نیوەی دووەمی شەستەکان شێوازێکی تایبەتی

هەبوو، کە بیرەوەریم بۆ ئەو ماوەیە دەمگەڕێنێتەوە هەستێکی تێکەڵاو لە خەم و شادی دامدەگرێت و نۆستالجیا بۆ جیهانێک دەمبات کە چەند ساڵێکی خایاند، دیدارەکان و ئێوارانی شیو خواردنی سلێخ و شەقامی تەها و جادریە و مەنسوور و ئێوارە موزیکییەکانی موزیکی کلاسیکی لە ماڵی سوهام سائیب شەوکەت لە شەقامی ئەبونەواس و پیاسەکانی رۆژانی هەینی بۆ بێستانی چادرچی لە فەحامە و جگە لە گەشتەکان بۆ کوردستان.

ئەو گەشتەی کە وەبیرم دێتەوە گەشتێک بوو بۆ وەرکا لەگەڵ سوهام سائیب شەوکەت و مەی حەیدەری هاوسەری کە بەداوەتنامەی پرۆفیسۆر "لنزنک" سەرۆکی تیمی ئارکیۆلۆجی ئەڵمانیایی بوو، سێ رۆژمان لە وەرکا بەسەربرد، ئەزموونێکی خۆش بوو، گردەکان و کەلەپووری شارستانیەتی سۆمەریمان بینی کە گەورەترین و کۆنترین شارستانێتییە کە مرۆڤایەتی بینیبێتی، ئێواران لەگەڵ سەرجەم ئەندامانی تیمەکە لە خێوەتەکەدا کۆ دەبووینەوە و لەگەڵ پرۆفیسۆر لنزنک شیومان دەخوارد، بە بایەخ و رێزەوە گوێمان لە قسەکانی دەگرت، لنزنک سەرپەرشتیی ئەو هەڵکۆڵینانەی دەکرد کە لە کۆتاییی یەکەم شەڕی جیهانییەوە لە عێراقدا دەکران و لە کۆتاییی شەستەکان عێراقی جێ هێشت، ناوبراو ئەو ماوەیە هەر لە عێراق بوو تا دووەم شەڕی جیهانی هەڵگیرسا و بەشەڕە بێزارکەرەکە ناوی دەبرد، چونکە بەربەست بوو لە بەردەم کارەکانیدا. ئێواران قسە و باس لەبارەی ئارکیۆلۆجیا و دۆزینەوە کەلەپوورییەکان بوو، لە یەکێک لەو ئێوارانەدا پرۆفیسۆر لنزنک باسی ئەو چرکەیەی کرد کە کەللەسەری داتاشراوی نەمری سۆمەریی دۆزییەوە، سەری ئافرەتێک لە وەرکا، کە جارجار بەمۆنالیزای عێراق ناوی دەبەن، لنزنک باسی هەست و هەڵچوونی خۆی دەکرد بە تایبەتی کاتێک کرێکارەکان بانگیان کردووە و هوتافیان بۆ کێشاوە و دەڵێت: "کاتێک گەیشتمە شوێنەکە دەموچاوەکە هەر لەژێر گڵدا بوو، کە بەرزم کردەوە و ویستم بەوریایی خۆڵی لەسەر لاببەم و دەموچاوەکە بەدیار کەوت، منیش وەک هەموو ئارکیۆلۆجییەکان خۆم بۆ نەگیرا، یەکیان لەبەر هەڵچوون و خرۆشان دەستی بەگریان کرد، کاتێک بەوریایی سەلکەکەم بەرز کردەوە بەڕاستی شتێکی نایاب بوو و هیچ پەیکەرێک نەیدەگەیشتێ".

سوهام له پرۆفیسۆری پرسی: ئاخۆ لەو باوەڕەدایە کە سەلکی ئەو ئافرەتەی وەرکا بەنرخترین پەیکەرە لەناو مۆزەخانەی عێراقدا؟

پرۆفیسۆر وەرامی دایەوە: بەنرخترین پەیکەرێک لەناو مۆزەخانەکەدا پەیکەری سەلکی مەلیک سەرجۆنە.



لەگەڵ جەبرا ئیبراهیم جەبرا، تەحسین هەورامی لەلای راست و خالید ئەلحافز لەلای چەپ کۆتاییی شەستەکان



یاریگەی گەل شەستەکان، لەگەڵ د. سالم دەمەلوەجی و عومەری کوڕی و مەیسونی کچی



جادریه له شه‌سته‌کان، له‌لای چه‌په‌وه: ره‌فعه‌ت چادرچی، به‌لقیس شه‌راره‌ی هاوسه‌ری،
نوها رازی و سوعاد رازی دایکی و من



کۆمەڵەی بەغدادیە لە شەستەکان، لەگەڵ مەعاز ئەلئالوسی و سۆزی هاوسەری



شەستەکان لەگەڵ دوکتۆرە سانیحە ئەمین زەکی

ساڵی ١٩٦٨، کتوپڕ پەردەیەکی ئاسناوی بەسەر عێراق دادرایەوە ئەمیش کودێتایەکی سەربازیی چاوەڕواننەکراو بوو، لە مانگە بەراییەکانی دوای کودێتا، سبەینەیەک بەغدادییەکان لە خەو هەڵسان و دیمەنی چەند کەسێکی لەداردراوی بێ دەسەڵاتیان لە مەیدانی- تحریر-دا بینی، ئەو دیمەنە دڕندانەیە نامەیەک بوو بۆ گەلی عێراق کە بەرنامەی حکوومەت سەرکوتکردنە.

ئەو چەند ساڵانەی، کە گەلی عێراق چێژیان لە ئازادییەکی ڕێژەیی بینی کۆتاییان هات، زمانی سیاسەت و ڕۆژنامەوانی و ڕاگەیاندن گۆڕا، دەزگای موخابەرات و ئەمن خۆیان خزاندە ناو جومگەکانی ژیانی سیاسی و ئابووری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی، کۆت و پێوەند خرایە سەر هاتوچوون و سەفەر، کەوتینە جیهانێکی داخراو، جیهانی ئۆرویل و کافکا کە لەوێدا مرۆڤ تەنیا ژمارەیەکە، دەوڵەت بڕیار لەسەر چارەنووسی دەدات، بە سەرەقەڵەمێک دەیهاڕێت و هەر کاتێک بیەوێت لە وجوودا نایهێڵێت.

ڕۆژێکیان، فوئادی برام بە هەڵەداوان هات بۆ لام و وتی: بەغدا جێ دەهێڵێت و واز لە وەزیفە و نووسینگەکەی دەهێنێت، فوئاد عێراقی جێ هێشت و تا ئەمڕۆش نەگەڕایەوە، دوای ماوەیەک برادەرێک پێی ڕاگەیاندین کە فرمانی دەستگیرکردنی زەیدی برام لە ئارادایە، زەید ماڵەکەی خۆی جێ هێشت و هەفتەیەک لای من مایەوە، دوایی بە ئۆتۆمۆبێل لە بەغداوە چووە هەولێر و پاشان گەیشتە چۆمان.

دەوڵەت، لە دەوڵەتە دیکتاتۆرییەکان فێری چاندنی تۆوی ترس بووبوو لە نێوان ریزەکانی گەلدا تا کۆنترۆڵیان بکات، کەسایەتیی دیار و لێوەشاوەیان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دەهێنایە سەر تەلەڤزیۆن، دوای ئازاردانێکی زۆر دەبوایە دان بەوەدا بنێن کە بەکرێگیراو و سیخوڕن، لەسەر ڕێبازی ستالینیش و لە ئەنجامی ململانێی ناوەخۆی حزب چەندان سەرکردەی حزبی لەناوبران و بەشێکی دیاریان لەدار دران.

ساڵی ١٩٧٩، لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆن خەڵک دیمەنی شانۆگەرییەکی

تۆقینەریان بینی، سەرکردەکانی حزب راوەستابوون و دانیان بە خیانەتیان دەنا و پاشان بەرەو مەرگ پەلکێشیان دەکردن، وردە وردە زۆربەی حزبییە کۆنەکان پاکتاو کران و حزب بووە دەزگایەک لە دەزگاکانی ئەمن.

دوای وتوویژ لەگەڵ کۆمپانیا نەوتییەکانی بیانی و هەڵویستی توندوتیژیان، ساڵی ١٩٧٢ کۆمپانیا نەوتییەکانی عێراق خۆماڵی کران، فەرمانبەرانی بارەگەی کۆمپانیا لە بەغدا بەسەر فەرمانگەکانی دەوڵەت دابەش کران، من وەزارەتی داراییم بەرکەوت، قەت ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات رۆژی یەکەم کە چوومە ناو وەزارەتەوە ٢٣ ساڵی رەبەق دەبمە فەرمانبەری ئەو وەزارەتە، سەرەتا بە بەڕێوەبەری دیوان دامەزرام و دوای ماوەیەک کرام بە یاریدەری بەڕێوەبەری بودجەی گشتی و پاشان شارەزا و ئینجا لێپرسراوی دامەزراوی رێکخراوە داراییە هەرێمییەکان و نێودەوڵەتییەکان کە عێراق تێیدا بەشدار بوو.

ئەو کاتەی من دامەزرام، ئەمین عەبدولکەریم وەزیری دارایی بوو و پێوەندیی کۆنی خێزانیمان هەبوو، برادەری زەیدی برام و پێشتریش برادەری فەیسەڵی برام بوو، پیاوێکی مەسلەکی و لە کاتی دەرچوونی لە کۆلێجی ماف لە چلەکان هەموو ژیانی لە وەزارەتی داراییدا بەسەربرد، سەرەتا بە وەزیفەیەکی بچووک دەستی پێ کرد ئینجا وردە وردە سەرکەوت تا بوو بە یاریدەری بەڕێوەبەری داراییی گشتی و پاشان وەزیری دارایی.

ئەمین عەبدولکەریم سەرەتا لەسەر دەستی ئەوانە ڕاهێنرا کە دوای سەربەخۆییی عێراق بنەمای ئەو وەزارەتەیان دانا لەمانە ئیبراهیم ئەلکەبیر کە یەکەم بەڕێوەبەری گشتیی دارایی و یەکەم بەڕێوەبەری گشتیی ژمێریاری عێراقی بوو، ئەو دوو بەڕێوەبەرایەتییە بڕبڕەی پشتی وەزارەتی دارایی و دەوڵەتی عێراق بوون.

ئەمین عەبدولکەریم سەر بە نەوەیەکی فەرمانبەرانی دەوڵەت بوو کە بە وردبینی و ئیلتیزام و پابەندبوون بەڕێسا و بنەماکانەوە دەناسرانەوە، دەسپاک و خۆڕاگر بوو، ساڵی ١٩٦٨ کرا بەوەزیری دارایی و کۆتاییی ساڵی ١٩٧٤ لەسەر کار لابرا.

لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکان، وەزارەتی دارایی خاوەنی دەسەڵاتێکی فراوان بوو، لە چوارچێوەی دامەزراوەییدا کاری دەکرد، دەبوایە وەزارەتەکان ئیلتیزام

بەجێبەجێکردنی بودجەی گشتیی دەوڵەت بەهەردوو لای دانراو و وەبەرهێنان بکەن، کاری زیادکردن زۆر زەحمەت بوو گواستنەوەش بە گوێرەی ڕێنوێنییەکان ڕێگەی پێ دەدرا.

فەرمانگەی پشکنەری گشتیی دارایی لە پشکنینی هەموو فەرمانگەکانی دەوڵەتدا دەسەڵاتێکی فراوانی هەبوو، زۆربەی فەرمانبەرانی وەزارەتی دارایی دانەیەک لە "یاسای شێوازی ژمێریار"یان لابوو و وەک سەرچاوەیەکی گرینگ لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکاریان دەهێنا بە تایبەتی فەرمانبەرانی بودجە دانان.

ئۆتۆمۆبێلەکەی "ئەمین عەبدولکەریم"ی وەزیر لە جۆری شۆفرلێت و مۆدێلی کۆن بوو، تەنیا شۆفێر و پۆلیسێکی بۆ دانرابوو، ئەمە بەر لە چەرخی تەرخانکردنی پاسەوانان بوو، ماڵی وەزیر لە خانووی حکوومەتدا نەبوو، بگرە لە خانووی تایبەتی خۆیدا بوو نێزیک گۆڕەپانی "الحرية".

سەرەتای کارکردنم لە وەزارەتی دارایی کە هێشتا ئەمین عەبدولکەریم وەزیر بوو "عیزەدین مەلاقەندی" کە لە سەردەمی مەلیکیدا جێگری یەکەمی سەرۆکی ئەنجوومەنی نوێنەران بوو دەستگیر کرا، دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزیش بە چەند ڕۆژێک دوای ئەوەی ساڵێکی لە گرتیگەی مەڵبەندی بەغدا لە بابولموعەزەم بەسەربرد ئازاد کرا و پاش ماوەیەک عێراقی جێ هێشت و تا هەڵگیرسانی شەڕی ناوەخۆ هەر لە لبنان مایەوە و دوایی گەڕایەوە عێراق، تەلەفۆنی بۆ کردین و وادەی گەیشتنی بۆ باڵەفڕگە پێ وتین، هەموو خانەوادە چووینە پێشوازی، بەڵام پیاوانی ئەمن لەوێ دەستگیریان کرد و بەرەو شوێنێکی نادیاریان برد، بەڕاستی بۆ خانەوادەکەی بەتایبەتی کچەکەی ئەزموونێکی زۆر ترسناک بوو، چەند مانگێکی پێ چوو، زۆر هەوڵمان دا شوێنەکەی بزانین، بەڵام بێ سوود بوو.

ڕۆژێکیان، ئەمین عەبدولکەریم لە نووسینگەکەی داوای کردم، کاتێک بەیەکەوە قسەمان دەکرد حەمید قازی بەڕێوەبەری گشتیی گومرگ هاتە ژوورەوە، ئەمین عەبدولکەریم وتی مامت هیچ هەواڵێکی نییە؟ وتم: نەخێر، حەمید قازی پرسی مەسەلە چییە؟ منیش بۆم باس کرد، سەیرم پێ هات کە بینیم قسەکانم دەنووسێتەوە بەتایبەتی ڕۆژی دەستگیرکردنەکەی مامم، حەمید قازی وتی کە برادەری لەمێژینەی بەڕێوەبەری ئەمنی بەغدایە و ئەمڕۆ قسەی لەگەڵ دەکات و

پاشان تەلەفۆنم بۆ دەکات.

من دەمـزانی حـەمـیـد قـازی بەر لەوەی ببـێـتـە بەڕێوەبەری گـشـتـیی گـومـرگ بەڕێوەبەری گشتیی پۆلیس بووە، بەڵام ئومێدێکی زۆرم پێ نەبوو بۆیە ئەو هەواڵەم بە خانەوادە رانەگەیاند، رۆژی پاشتر تەلەفۆنی بۆ کردم و یەک قسە وتی عیزەدین مـەلافـەندی ئەمـڕۆ ئازاد دەکرێت و دوای مـاوەیەک فـەرمـانگەی ئەمن تەلەفـۆنم بۆ دەکـەن تـا بچـم وەری بگرم، بڕوام نـەکـرد، بەڵام رێک دوای چەند سـەعـاتێک ئەفسەرێکی ئەمن تەلەفۆنی بۆ کردم تا بچـم کەفالەتی عیزەدین مـەلافـەندی بکەم، ئەوە مـوعجیـزە بوو، ئێمە هیـوابڕاو بووبووین و دەمـانوت جارێکی تر نایبینینەوە، ئەوەی حەمید قازی کردی قەت لە بیر ناکرێت.

دوکتۆر سـەعدی ئیبـراهیم لە شوێنی ئەمین عـەبدولکەریم کرا بەوەزیری دارایی، بەڵام زۆر لەو پایەدا نـەمـایەوە، لە کـۆنگرەیەکی دارایی لە دەرەوەی وڵات کـۆچی دوایی کرد، دوایی ئەو دوکتۆر فـەوزی قەیسی پارێزگاری بانکی مەڵبەندی عێراق کرا بە وەزیری دارایی، دوکتۆر قەیسی چرایەک بوو لە زیرەکی و بزاڤ و نوکتـەی بەغدایییانەی دەگمەن و خـۆشی لا بوو، قسەزان و بزێوێکی سەیر بوو، وەبیرم دێت لە کـاتی کۆڕی سـاڵانەی وەزیری دارایی لەبارەی بودجـەی گـشـتـیی دەوڵەتەوە لە کۆمـەڵەی ئابووریناسـانی عێـراق، دوکتـۆر کازم سەعیدی دوای کۆتاییی کۆڕەکە وتی: کۆڕەکە زۆر بەنرخ بوو، بـەڵام تێبینییەکم لەبارەی پارەی دانراو بۆ پاڵپشـتی هەیە، هەندێک کەلوپەل بەهایەکی ئەوتۆیان نییە تا پاڵپشتی بکرێن بۆ نموونە نۆک، دوکتۆر قـەیسی یەکسـەر وەرامی دایەوە کە رێزی بۆ تێبینییـەکە هەیە، بەڵام نۆک بەنیسبەت گەلی عێراقەوە مادەیەکی بنەڕەتییە و پەندێکی بەناوبانگی عێراقی هەیە دەڵێت "الحمص بکل جدر ینبص"، کۆڕەکە بوو بە پێکەنینێکی بەردەوام، جـەمـاوەر لەوە گەیشت وەرامەکەی دوکتۆر قەیسی دوو لێکدانەوەی بۆ دەکرا.

دوکـتـۆر فـەوزی قـەیسی سـاڵی ١٩٧٩ کـۆچی دوایی کـرد، سـامـیـر رەزووقی شێـخلی باڵوێزی عێـراق لە کوێت لە بریی ئەو کرا بەوەزیری دارایی، ئەو کاتەی سـامیر وەک باڵوێز چووە کوێت، پێوەندیی عێراق و کوێت لەوپەڕی خـراپیدا بوو، بەڵام کە کوێتی جێ هێشت پێوەندیی نێوان هەردوو وڵات باش بوو.

سامیر رەزووقی شێخلی، لە بارودۆخێکی ناهەمواردا پۆستی وەزارەتی دارایی

وەرگرت بەتایبەتی دوای گۆڕانکاری لە سەرۆکایەتیی کۆمار و هەڵگیرسانی شەڕی نێوان عێراق و ئێران و ئەو کارەسات و تەنگژانەی ئەو شەڕە بەدوای خۆیدا هێنای، برادەرێک بۆی گێڕامەوە رۆژێکیان چووەتە نووسینگە و لە باروذۆخێکی سەیردا وەزیری بینیوە وەک بڵێی دەگریا، چاوی سوور هەڵگەڕابوو و دەموچاوی خەمێکی قووڵی پێوە دیاربوو، دیاربوو هەواڵی لەداردانی دوکتۆر "ریاز حوسێن"ی وەزیری تەندروستیی بینیبوو کە برادەرێکی نێزیکی بوو.

رەزووقی لە پایەکەی لادرا، چونکە گومانیان لە دڵسۆزیی هەبوو، دوای ساڵێک لەسەر کارلادانی، پیاوانی موخابەرات سەردانی بریکاری وەزارەتی داراییبان کرد ئەمیش بۆ لێکۆڵینەوە لەو برە پارەیەی کە لە دەرەوە و بەرێگەی بانکی رافیدەین بۆ سامیر رەزووقی شێخلی هاتبوو، وەکیلی وەزارەت قسە لەگەڵ رەزووقی دەکات و دیار دەکەوێت ئەم حەواڵەیە لە بریی بەکرێدانی خانووەکەی بووە کە پێشتر دابووی بە کۆمپانیایەکی ئیتاڵیایی و داوای کردبوو بەهۆی دەزگای فەرمیی بانکەوە پارەکەی بۆ بنێرن نەک بە نەخت لە کۆمپانیاکە وەری بگرێت، ئەم پرۆسەیە زۆر زیانی بەرەزووقی گەیاند.

لە زۆربەی ئەنجوومەنە کارگێڕییەکانی دامەزراوە داراییە هەرێمییەکان و نێودەوڵەتییەکان کرام بە ئەندام لەمانە سیپەی ئۆپێک بۆ پەرەپێدان لە ڤیەننا، هەرسێ مانگ جارێک بۆ کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی پارێزگاکان دەچوومە ئەوێ چونکە پارێزگاری بەنۆرە بووم.

ئەو کاتە سەفەرکردن قەدەغە بوو، ئەو ناردنانە بۆ من هەلێک بوو تا هەناسەیەک وەربگرم و لە کەشوهەوای خنکێنەری ناو عێراق رزگار بم، هەروەها هەلێک بوو بۆ دیتنی براکانم و کەسانی خانەوادەکەمان و برادەرانم لە دەرەوە و ئینجا کڕینی کتێب و کۆوار.

کتێب ئەو کاتە لە عێراقدا بڤە بوو، ناچار ئەو ماوەیەی لە دەرەوە دەبووم بە پەلە کتێبم دەخوێندەوە و دوایی لای برادەرێک دام دەنا، لەو کتێبانە کتێبی راپۆرتی ساڵانەی رێکخراوی لێبووردنی نێودەوڵەتی بوو لە کتێبخانەی ئینگلیزی (The English Book shop) لە ڤیەننادا کڕیم، ئەو کتێبخانەیەی ڤیەننا چێژێکی خۆشی هەبوو، هەر لە ڤیەننا حەمید سامیر سەرۆکی فەرمانگەی دەرکردە لە بانکی

مەڵبەندی عێراق کتێبی "کۆماری تۆقاندن"ی دامێ، لە ژوورەکەی خۆم لە هوتێل ئەو کتێبە سەرسوڕهێنەرەم خوێندەوە و ئەوەم بەبیردا نەدەهات کە ناوی دانەرەکەی خوازراوە، دانەری ئەو کتێبە "کەنعان"ی کوڕی محەمەد مەکیە بوو کە لەگەڵ من و فوئادی برام برادەرایەتییەکی پتەومان هەبوو، دوای خوێندنەوە کتێبەکەم داوە بە حەمید سامیر، چونکە نەدەکرا بیهێنمەوە بەغدا.

لە سەردانەکانمدا بۆ ڤیەننا، زۆرجار چاوم بە مونیر ئەڵلاوێردی دەکەوت کە لەوێ جێنشین بوو و پێوەندیی برادەرایەتیمان هی ساڵانی چلەکان بوو، مونیر ئەندازیاری مەدەنی و کلارنێتژەنێکی بە توانا بوو، چەند پایەیەکی بەرزی لە نەتەوە یەککگرتووەکان وەرگرت، کاتێک لە ساڵی ١٩٧٧ بۆ کۆبوونەوەی کۆنگرەیەک لەبارەی پەرەپێدانەوە لە چوارچێوەی شاندێکی عێراقیدا چوومە یەمەن لەوێ چاوم بە مونیر کەوت، عەبدوڕەحمان مونیفی ئەدیبیش لەگەڵ ئەو شاندەدا بوو، غەشەمی ئەو کاتە سەرۆکی یەمەن بوو، مونیر لە شوێنی دانیشتنی بۆ ئێوارەیەکی گوێگرتن لە مۆزیک داوەتی کردم، لەو ئاهەنگەدا مونیر هەندێک لە کارەکانی - هایدن، شوبارت-ی ژەنی، ژەنیارەکان ئەندامانی سلکی دیپلۆماتی و کارمەندانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بوون لە سەنعا، هەروەها دوکتۆر فارووق برتۆ نوێنەری ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی لە سەنعا ئامادە بوو.

هەر لە سەردانەکانمدا بۆ ڤیەننا، دوای کۆبوونەوەکانی سیپەی ئۆپێک دەچووم سەیری ئۆپێرام دەکرد و بەتایبەتی بەرهەمەکانی مۆزارت، کە هەندێکیانم چەند جارێک بینی لەوانە:

(Marriage of Figaro Don Giovanni, Cosi Fan Tutte The Magic Flute)

لە کۆبوونەوەی ساڵانەی سیپەی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی کە دوو ساڵ لەسەر یەک لە واشنتۆن و دواییش لە وڵاتێکی جیهانیی سێیەم ساز دەدرا ئامادە بووم، لە کاتی سەردانی واشنتۆندا، هەرسێ برا، من و فوئاد و نەوزاد جگە لە دلاوەری برازام کە کوڕی فەیسەڵ بوو بەیەکەوە کۆ دەبووینەوە، نەوزاد، سەرۆک و بەشداربوویەکی سەرەکیی کۆمپانیایەک بوو لە شاری بووتلاند"ی پایەتەختی ویلایەتی ئەریگۆنا، ئەو کۆمپانیایە لقی لە چەند شارێکی ئەمەریکا و ئەبوزەبیدا

هەبوو، فوئادیش لە شاری "ئۆبرن"ی زانکۆی ویلایەتی ئەلاباما جێنشین بوو، بەڵام دلاوەر لە "واشنتۆن"ی پایەتەخت جێنشین و کاریشی دەکرد.

فوئاد، ساڵی ١٩٦٩ بەغدای جێ هێشت و چووە زانکۆی هارڤەر و بڕوانامەی ماجستێری بەدەست هێنا و پاشان لە زانکۆی بنسلڤانیا بڕوانامەی دوکتۆرای وەرگرت و لە ئەنجامدا کرا بە مامۆستا لە زانکۆی ئۆبرن، دوای ماوەیەک چووە سعوودیە تا لە زانکۆی مەلیک فەیسەڵ لە دەمام وانە بڵێتەوە، وەک خۆی باس دەکات ئەو ماوەیەی لە بەیرووت بووە خۆشترین ماوەی ژیانی بووە، دوای هەڵگیرسانی شەڕی ناوەخۆ بەناچاری بەیرووتی جێ هێشت لە شاری "ئۆبرن"ی ویلایەتی ئەلاباما گیرسایەوە و زۆربەی کاتی بەڕەسمکردن بەسەر دەبات.

لە کاتی خوێندنی لە کۆلێجی بەغدا، نەوزاد لە قوتابییە سەرکەوتووەکان بوو جگە لەمەش لە وەرزشیشدا هەر سەرکەوتوو بوو و یاریزانی هەڵبژاردەی عێراقی بۆ تۆپی سەبەتە بوو، لەو قوتابییە بەراییانە بوو کە ساڵی ١٩٥٧ نێردەی زانستی لە ئەمەریکا دەسکەوت.

ساڵی ١٩٥٦، ئاهەنگی دەرچوونی قوتابیانی کۆلێجی بەغدا لە هۆڵی - الامانة- ساز درا، لەو ئاهەنگە کە وەزیری پەروەردە خەلیل کنە و وەزیری ناوەخۆ سەعید قەزاز تێیدا بەشدار بوون، کارگێڕی کۆلێجەکە نەوزادیان دەستنیشان کرد وتەی ساڵانەی دەرچووان بخوێنێتەوە، بە هەمان جۆش و خرۆشەوە نەوزاد لە ئەمەریکا ژیانی خۆی ڕێک خست، یەکەمیان لە خوێندنی زانکۆیی و دووەمیشیان لە ژیانی ڕۆژانەیدا، نەوزاد کەسێکی هێور و هەردەم زەردەخەنەی لەسەر لێوان بوو و گفتوگفتی لەگەڵ هەمووان دەکرد، خوێندەوارێکی چاک و لە ڕۆژنامە ئەمەریکییەکاندا وتاری بڵاو دەکردەوە، سەرەڕای ئەو سیفەتانە خاوەن دڵێکی فراوانە و هەردەم هەواڵی خانەوادە دەپرسێت و بەشداریی خۆشی و ناخۆشییان دەکات و یارمەتییان دەدات.

وەک برا سەیری "دلاوەر"ی برازامان دەکرد، چونکە لەگەڵ نەوزادی برام تەنیا ساڵێکیان بەینە، دلاوەر لە ژیانیدا نموونەی میانڕۆیی و جیدییەت بوو. ساڵی ١٩٨٠، شەڕی عێراق- ئێران دەستی پێ کرد، عێراق کەوتە ناو تۆنێلێکی تاریکەوە، شەڕ سەرجەم توانای مادی و مرۆیی لەناوبرد، ئابووریی عێراق داڕما،

سـەرەڕای ئەو دروشـمـەی کـە بەرزیان کـردبووەوە "بەدەسـتـێک بنیـات دەنێین و بەدەسـتـێکیش شـەڕ دەکـەین" بەڵام ئابووریی وڵات بوو بە ئابووریی شـەڕ، خۆپڕچەککردن پانتاییـیەکی گەورەی لە بودجەی گشتی داگیر کرد، نەختینەی یەدەگ لە بانکی مەڵبەندیی عێراق لە سەرەتای شەڕدا نێزیکەی ٤٠ ملیار دۆلار بوو، بەڵام دوایی کـەوتە بن قـەرزێکی قورسی دەرەکی کە بڕەکەی گەیشتە ١٤٠ ملیار دۆلار، داهاتی تاکی عێراقی لە ٤٠٠٠ دۆلارەوە گەیشتە ٤٥٠ دۆلار، نرخی سەرفی دیناری عێراقی لە ٣,٠ گەیشتە ٣٠٠٠ دینار بۆ یەک دۆلار.

شـەڕ بووە هۆکـاری ئەوەی لاوانی عـێـراق بۆ ماوەیەکی زۆر بخـرێنە ریزەکـانی سوپاوە و لە فـێـربوون و راهێنـان و وەدەسـتـهـێنـانی شـارەزایی بێـبـەش بن و لە پرۆسـەی بەرهەمـهـێناندا بەشدار نەبن، نێزیکەی یەک ملیۆن عێراقی لەو شـەڕەدا کوژران، سـەدان هەزار کەسـیش لەژێر ئەشکەنجـەدا مـردن یان لەدار دران یاخۆ گوللەباران کران چونکە لە گۆڕەپانی شەڕ رایان دەکرد، لافیتەکانی پرسەنامە بە رەنگی رەش دیواری مـاڵی شـارە عێراقییەکانی داپۆشـتبوو، بەتایبەتی بەغدا کە بووبووە دیمەنێکی رۆژانەی ئاسایی.

بەتۆمەتێکی بێ بنەما رەفعەت چادرچی دەستگیر کرا، من و فائیزەی هاوسەرم و بەلقـیـسـی هاوسـەری رەفـعـەت لە رۆژێکی دیاریکراودا لە گـرتیگەی ئەبوغـرێب سـەردانمان کـرد، دیدارەکـە لـە قـاوشـێـکی گـەورەدا بوو لە هـەمـان کـات هـۆڵی نووسـتنیش بـوو، کە چووینە ناو هۆڵەکـەوە سـەرم سـوڕمـا، زۆربەی گـرتیـیـەکـان ناسیاو و برادەر بوون، هۆڵەکە پزیشک و ئەندازیار و مامۆستای زانکۆی بەخۆوە گرتبوو، هەستم بە تراجیدیای عێراق کرد، گرتییەکانی گرتیگەکە خەڵکانی خاوەن عەقڵی گەورە و دەستەبژێری داهێنەر بوون.

بە هەنجـەتی سـەر بە ئێران بوون، دەیان هەزار ژن و پیـاوی عـێـراقی رەوانەی ئێران کران، ٥٠٠٠ گوندی کوردان خاپوور کران، شاری هەڵەبجە کیمیاباران کرا، هەڵمـەتی پاکتاوکردنی رەگەزی دژ بە کـورد دەستی پێ کرد بەتایبەتی لە پرۆسـەی ئەنفالدا دەیان هەزار پیرەمێرد و ژن و منداڵ کوژران و ژمارەیەکیشیـان لە گۆڕی بە کۆمەڵدا زیندەبەچاڵ کران.

هێشـتـا سێ سـاڵ بەسـەر بڕانەوەی شـەڕدا تێ نەپەڕیبوو کـە جیـهـان و گـەلی

عێراق سەرکێشی و سەرەڕۆییەکی تری دڕندانە و پڕ کارەساتیان بینی کە ئەمیش داگیرکردنی کوێت بوو، سەرجەم کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی سەرکۆنەی ئەو داگیرکردنەیان کرد و زۆربەی وڵاتانی جیهان بەهێزی سوپایی لە رزگارکردنی کوێتدا بەشدارییان کرد، دوای بەزینی سوپای عێراق لە زۆربەی پارێزگاکانی عێراقدا ڕاپەڕین دژ بە ڕژێم دەستی پێ کرد، بەڵام بەوپەڕی دڕندەیی و توندوتیژی سەرکوت کران.

گاردی کۆماری هاتە ناو شاری هەولێر و هەڵیان کوتایە سەر ماڵان و تاوانی دڕندانەیان کرد، زۆربەی دانیشتوان بە ئۆتۆمۆبێل یان بە پێ روویان لە چیاکان کرد، دایکم و خوشکەکانم و خەزوورم و ژمارەیەکی زۆر لە خزمانم لە هەولێر بوون، هیچ هەواڵێکیان نەبوو، چەندان رۆژی ترسناک تێ پەڕین و نەماندەزانی چی بکەین، لەسەر شاشەی تەلەڤزیۆن ئاپۆرەی ژن و پیاو و منداڵانمان دەبینی کە لەناو بەفردا ریزیان بەستبوو و بێ خۆراک بوون و باڵەفڕەی عێراقیش بەسەریاندا دەسووڕایەوە، دوای چەند رۆژێک خوشکی گەورەم و براژنم گەیشتنە لامان، ماندوویوون و ترسیان پێوە دیاربوو، بە دوو رۆژ لە رێگەی مووسڵەوە هاتبوونە بەغدا، پیاوانی سەیتەرە زۆر بەخراپی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کردبوون، گاردی کۆماری ژمارەیەک گەنجی دەستگیر کرد کە تا ئێستا چارەنووسیان بزرە.

دەیەی نەوەتەکان، دەیەی ئابڵووقە و بێبەشی و ئێش و ئازار بوو، تیرۆر و سەرکوتکردن بەدڕندەترین شێوە بەردەوام بوو، لە سەرەتای نەوەتەکان (٣٠) گەورە بازرگان لە بەغدا لەدار دران، هەر لەو ماوەیەدا دەوڵەت دەستی بە خاپوورکردنی زۆنگاوەکان کرد و هەوڵی دا تەختیان بکات، زۆنگاوەکان گەورەترین گردبوونەوەی شارستانی و بایەخێکی شوێنەوارییان هەبوو کە مێژووەکەی دەگەڕایەوە بۆ رۆژگاری سۆمەرییەکان، خاپوورکردنیان تاوانێک بوو دژ بە شوێنەوار و مرۆڤایەتی.

لە نەوەتەکاندا، بارودۆخم وای دەخواست مانگی جارێک یان دووجار سەردانی هەولێر بکەم، زۆربەی ئەندامانی خانەوادەکەم "دایکم، خوشکەکانم، مامم" و زۆربەی خزمەکانم لە هەولێر بوون، بەڕاستی سەفەرکردن بۆ هەولێر ئازارێکی راستەقینە بوو، لە بازگەی حکوومەتدا بێ رێزییان بەرامبەر خەڵک دەکرد، لە دوا

خالی بازگەی حکوومەتدا بەنزینی ئۆتۆمۆبێلەکانیان بەتاڵ دەکرد و بایی ئەوەندەیان دەهێشتەوە شۆفێرەکە بگاتە هەولێر، جاری واش هەبوو ڕێگەیان دادەخست و دەبوایە بگەڕێینەوە، ماوەیەک هاتنی ئۆتۆمۆبێلی سالۆن بۆ ناو هەولێر قەدەغە کرا، ڕێبواران لە دوا بازگەی حکوومەتدا سواری لۆریان دەکران و بەشێوازی ناشیرین بەڕێ دەکران، لە بەخت باشیم من لە ساڵی ١٩٩٥ەوە لە وەزارەتی دارایی خانەنشین کرام، چونکە خزمەتی یاساییم تەواو کردبوو و بۆیە هیچ کۆت و پێوەندێک لەسەر سەفەرکردنم نەبوو.

سەیرە، من کە باسی ئەو سێ دەیە شەوەزەنگە دەکەم و سەرەڕای ئەو تاریکاییە، بەڵام لە توانادا هەبوو هەندێک کلاوڕۆژنە و ڕووناکی ببینین کە لەو جیهانە بێ دەروازە و پەنجەرەیەدا وەک ئۆکسجین وابوو، ئەو چراخانانە هەندێک جار ڕووداوی خۆش بوون، سەرەڕای ئەو هەموو پاڵەپەستۆ و ئێش و ئازارە، بەڵام کەسانێک هەبوون کە بە توانای داهێنەرانە و ڕۆشنبیری و حیکمەت و بەهای بەرزەوە دەناسران و ژیانیان بەسەردەبرد.

وەبیرم دێت، دەوڵەت ڕێزی لە پیانۆژەنی جیهانی خاتوو "بیاتریس ئۆهانسیان" نا و پیانۆگراندێکی جۆری شتانیوای پێشکێش کرد و بەباڵەفڕەیەک لە ئەڵمانیاوە هێنایان، بەم بۆنەیەوە لە ماڵەکەی خۆیدا لە عەلەویە خۆی و سیستای خوشکی داوەتێکی شێوخواردنیان ساز دا، من و فائیزەی هاوسەریشم بانگ کراین، بەڕێوەبەری ئینستیتۆی ڕۆشنبیری فرەنسایی و هاوسەرەکەشی بانگ کرابوون، ئەو بەڕێوەبەرەش پیانۆژەنێکی بەتوانا بوو، ئەو شەوە بیاتریس لە ترۆپکی بەختەوەری دابوو، ئەو پیانۆیەی دەژەند کە بەر لە چەند هەفتەیەک بۆی هاتبوو، بەڕاستی بیاتریس چرایەکی ڕۆشنی بەغدا بوو.

بەڕێگەی زەیدی برامەوە "عەبدوڕەزاق شێخلی"م ناسی، ناوبراو لە سەردەمی مەلیکیدا ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران و نوێنەرایەتیی ئۆپۆزسیۆنی دەکرد و زۆریش توند بوو، بەڵام کە بینی عێراق چی بەسەر هات و زوڵم و زۆرداری و نەمانی دیموکراسییەت چییان بەسەر خەڵک هێنا، ئەمیش وەک زۆربەی ئاوکوفەکانی بیروڕای گۆڕا، ماڵی عەبدوڕەزاق لە شەقامی ئەبونەواس بەرامبەر کەڕادەی مریەم بوو و لە ماڵی ئێمەوە نێزیک بوو، جارجار سەردانم دەکرد و لە

کتێبخانەی "مەکەنزی"یەوە بە ئۆتۆمۆبێلی من بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، شێخلی پیاوێکی خوێندەوار و زۆر بوێر بوو، نەیدەزانی پان بکاتەوە، لەو ساڵانەی دوای خۆی بۆ تۆژینەوە لە فەلسەفەی هیندی تەرخان کردبوو، زۆر بەفەیلەسووف و موتەسەویفی هیندی "کریشنامورتی" کاریگەر بوو، ساڵانە بۆ گوێگرتن لە کۆڕەکانی دەچووە سویسرا، لەو سەربووردانەی کە لە شێخلی دەگێڕنەوە جارێکیان خۆی بۆ سەفەری سویسرا ئامادە دەکات، داواکارییەک پێشکێش بە پارێزگاری بانکی مەڵبەندی عێراق دەکات و داوا دەکات پارەی بۆ رەوانەی دەرەوە بکەن، کاتێک خەریکی پڕکردنەوەی ئەنکێتەکە دەبێت لە پرسیارێکدا هاتووە هۆی سەفەرکردنت چییە؟ ئەمیش دەنووسێت سەفەرەکەم گەڕانە بەدوای راستیدا، کاتێک ئەنکێتەکە دەگاتە بەردەم پارێزگاری بانکی مەڵبەندی کە ئەو کاتە دوکتۆر فەوزی قەیسی بوو، نەک هەر ڕەزامەند بوو، بگرە بڕە پارەکەشی کرد بە دووقات.

لە کۆتایی نەوەتەکاندا، ئینستیتۆی فرەنسایی رای گەیاند کە پێشانگەیەک بۆ ئەو گەورە هونەرمەندە شێوەکارانە دەکاتەوە، کە لە فرەنسا هونەریان خوێندووە، دیارکەوت کە ئینستیتۆ لەگەڵ مەڵبەندی سەدام بۆ هونەرەکان رێک کەوتبوون تا تابلۆکانیان بدەنێ، بەڵام لە چرکەی دواییدا مەڵبەندی سەدام داوای لێبووردنیان کرد، ئەم هەڵوێستە ئینستیتۆی تووشی لە روودامان کرد چونکە پێشتر ئەو پێشانگەیە جاری بۆ درابوو و خەڵکیان داوەت کردبوو، رێکخەری پێشانگەکە "لیونیل فیرۆ"ی راوێژکاری رۆشنبیری و سەرپەرشتیاری ئینستیتۆ و برادەری هونەرمەندە عێراقییەکان بوو، ئەو ماوەیەی کە لە عێراق بوو لە مەڵبەندی رۆشنبیری و هونەری عێراقی، لەوێ عێراقییەکان ئامێری مۆزیکیان دەژەند و حوسێن ئەعزەمی کۆڕێکی لەبارەی مەقاماتی عێراقییەوە ساز دا، هەروەها شانۆگەرییەکی ئەزموونگەری عێراقی پێشکێش کرا.

عێراقییەکان، ئەوانەی برادەری فیرۆ بوون پێشنیازیان کرد کە چەند تابلۆیەک بەگوێرەی داواکاری بدەن بە ئینستیتۆ تا پێشانگەکە بەردەوام بێت، فیرۆ ئەو بیرۆکەیەی پەسند کرد، ژمارەیەکی زۆر لە برادەرانی ئینستیتۆ تابلۆکانیان پێشکێش کرد و پێشانگەکە سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا.

لە کۆتایی نەوەتەکاندا، بیرەوەرییەکانی "ئەحمەد موختار بابان"ی دوا سەرۆک

وەزیرانی سەردەمی مەلیکی بڵاو کرایەوە، مێژوونووسی گەورە "کەمال مەزهەر ئەحمەد" نووسیبوویەوە و ڕێکی خستبوو و ڕۆڵێکی بنەڕەتیی تێدا بینی، ئەم کتێبە باشترین بیرەوەری بوو کە لەم دە ساڵەی دواییدا بڵاو کرایەوە، لەو ماوەیەدا خاتوو "سەراب بابان" کچی ئەحمەد موختار بابان و دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد رایان سپاردم، لە کاتی سەردانەکانم بۆ عەمان، ڕەشنووسی کتێبەکە بگەیەنمە عەتا عەبدولوەهاب، عەتا لە عەمان جێنشین بوو، وەک ڕاوێژکار لە دەزگای – الكيالي – بۆ بڵاوکردنەوە کاری دەکرد و هەر ئەو دەزگایەش کتێبەکەی بە چاپ گەیاند.

دوای ئەزموونێکی تۆقێنەر و توند لەگەڵ ڕێژیم و مانەوەی پێنج ساڵ لە گرتیگە و چاوەڕێکردنی حوکمی لەداردان، نەیدەزانی کەی ئەو حوکمە جێبەجێ دەکەن، ئەزموونێک لە سەرووی توانای مرۆڤەوە بوو، عەتا عێراقی جێ هێشت و لە ئوردن گیرسایەوە، ئەو ئەزموونە بۆ عەتا بووە توانایەکی داهێنان لە بواری شیعر و پەخشان نووسین، لە گرتیگە "هاملێت"ی بە شیعرەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی.

لە چرا ڕۆشنەکانی ئەو ماوەیە، کردنەوەی پێشانگەی شێوەکاری و سازدانی ئێوارەکۆڕی شیعر خوێندنەوە و گێڕانی کۆڕ و کۆبوونەوە بوو، ئەمانە دەستپێشخەری تاکەکەسی بوون و پێوەندییان بە دەوڵەتەوە نەبوو، بۆ نموونە لە هۆڵی ئورفەلی بۆ هونەر پێشانگە دەکرایەوە و هونەرمەند خاتوو ویداد ئورفەلی بەڕێوەی دەبرد، کۆڕ و پێشانگەی شێوەکاری لە گالیری بەغدا لە مەیدانی فیردەوس هونەرمەند خاتوو سەمیرە عەبدولوەهاب بەڕێوەی دەبرد، چالاکییەکانی هۆڵی دیجلە بۆ هونەر لە شەقامی ئەبونەواس هونەرمەند خاتوو زەینەب مەهدی بەڕێوەی دەبرد، جگە لە ئێوارەکۆڕ بۆ مەقاماتی عێراقی و مۆزیکی کلاسیکی لە ماڵی عێراقی کە کەوتبووە کۆتاییی شەقامی ڕەشید لە باب ئەلشەرقی و خاتوو ئەمەل خزەیری بەڕێوەبەری بوو.

ماڵی عێراقی، خانوویەکی کۆن بوو و لەوپەڕی جوانیدا بوو، موڵکی یاسین خزەیری باوکی ئەمەل بوو، ئەو ماوەیە ئەمەل شوێنەکەی کرد بەمەڵبەندێکی ڕۆشنبیری، لەو ئێوارەکۆڕانەی ماڵی عێراقی کە بەبیرم دێت سازدانی ئاهەنگێکی

مۆزیک بوو کە باڵوێزخانەی ئیتاڵیا بە هاوبەشی لەگەڵ ئەمەلدا ڕێکیان خست و تایبەت بوو بەمۆزیکی باروک لە ئیتاڵیا وەک بەرهەمەکانی ڤیڤالدی، سکالاتی، بوفارینی، باڵوێزی ئیتاڵیا - دی مارنینو - لە وتەیەکدا باسی مۆزیکی سەدەی حەڤدەی لە ئیتاڵیادا کرد، ئەو ماڵە جوانە لە شەڕی ساڵی ٢٠٠٣ درایە بەر تۆپ و خاپوور بوو.

لە ناوەڕاستی نەوەتەکان، جەبرا ئیبراهیم جەبرا بە نۆرەدڵێ لە ماڵەکەی خۆیدا لە مەنسوور کۆچی دوایی کرد، بەبۆنەی تێپەڕبوونی سێ ساڵ بەسەر کۆچی دواییدا، لە ڕۆژنامەی - الحیاة-ی لەندەنی ڕۆژی ١٩٩٨/٦/١٥ وتارێکم بە ناونیشانی "جەبرا ئیبراهیم جەبرا: سەرەتاکان" بڵاو کردەوە، ئەمە چەند بڕگەیەکی ئەو وتارەیە:

"جەبرا ئیبراهیم جەبرا، کاتێک بە شێوازە ژیرانییەکەی قسەی دەکرد کۆمەڵەی "بلومسبری" بیر دەخستینەوە، زۆر سیمای ئەو کۆمەڵەیەی بەخۆوە گرتبوو وەک ژیری، لێبووردەیی، خۆشەویستیی خۆڕسک بۆ جوانی، وەک سەرانی ئەو کۆمەڵەیە گەورەترین دەسکەوتەکانی جەبرا ئەو چاویلکەیە بوو کە پێی سەیری ژیانی دەکرد، لە کاتێکدا زۆربەی خەڵک ژیان بە هەردوو ڕەنگی "ڕەش و سپی" دەبینن، بەڵام ژیانی جەبرا تێکەڵەیەک بوو لە ڕەنگە گەشەکان، تا ڕۆژی وەفاتی هەر ڕەنگی جوانی دەدۆزییەوە.

لە کۆتاییی چلەکاندا و دوای هاتنی بۆ بەغدا بە چەند مانگێک جەبرام ناسی، ئەو کاتە لەگەڵ دوکتۆر - حلمي سمارە-ی برادەری لە بانسیۆنێک نیشتەجێ بوون کە خاتوونێکی یۆنانی لە کۆتاییی شەقامی ڕەشید بەلای باب ئەلشەرقییەوە بوو بەڕێوەی دەبرد، تا کۆچی دوایی بەر لە سی ساڵ برادەرایەتیمان هەر بەردەوام بوو.

هەر لە ڕۆژانی بەرایی و هاتنی بۆ بەغدا، جەبرا کاریگەری خۆی بەسەر کەشوهەوای فیکری و ڕۆشنبیرە لاوەکانی بەغداوە نەخشاند، لاوان و شاعیران و ئەدیبان و هونەرمەندان گوێیان لێ دەگرت و ئەویش باسی بزاڤی شێوەکاری و شیعر و ڕۆمانی ئەورووپای بۆ دەکردن، جەبرا لەگەڵ جەواد سەلیم یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی "کۆمەڵەی بەغدا بۆ هونەری تازە"".



نەوزاد و مەلیسای کچی سەردانی ماڵی شێخ جەمیل ئەفەندی (باپیری فائیزە لە دایکیەوە) لە قەڵای هەولێر ساڵی ١٩٨٩ دەکەن، فەرمانگەی شوێنەوار خانووەکەی وەرگرت



داوەتێکی شیوخواردن لە هەشتاکان،ماڵی ئەمین رەئووف ئەمین لە شەقامی تەها،
لەلای چەپەوە. د. عەلی وەردی، ئەمین رەئووف ئەمین، مەنزیر مونیر عەباس،
عەبدولحەمید بەعیجاب باڵیۆزی دەوڵەتی کوێت، من



گالێری بەغدا لە هەشتاکان،
لە ڕاستەوە من، ئیسماعیل شێخلی، د. نووری مستەفا بەهجەت، نووری ئەلڕاوی



جادریه کۆتاییی سالی ١٩٨٥، لەلای ڕاستمەوە: عەتا عەبدولوەهاب، دوڕیە عەونی، ڕۆژنامەنووسی میسری جالە ئەلەخزونی



گالێری بەغدا لە هەشتاکان، لەلای ڕاستەوە: د. خالید قەساب، د. نووری مستەفا بەهجەت، سەعد ئەل کەعبی، من، سەمیرە عەبدولوەهاب



گەشتی نەمروود، لەلای چەپەوە فائیزە، فاخیرە دۆغرمەچی، نائیلە چادرچی



گەشتی نەمروود لەگەڵ رافیع ئەلناسری و یەقزان ئەلچادرچی



جادریه له هەشتاکان: یوسف ئەلعانی لەلای راست و هێزی زفویدا لەلای چەپ، نازم رەمزی وێنەکەی گرتووە



مەحموود، نەوزاد و فوئاد، واشنتۆن له هەشتاکاندا

(١٥)ی ئادار:

رادیۆ رای گەیاند کە لە ماوەی هەفتەیەکدا شەڕ دەست پێ دەکات، ڕەشنووسی ئەو بڕیارەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و ئیسپانیا پێشکێشیان کرد، لەلایەن شەش ئەندامەکەی ئەنجوومەنی ئاسایش پاڵپشتی نەکرا هەرچەندە لەلایەن بەریتانیاشەوە دەسکاری کرا، بۆیە ئەوان دەکشێنەوە، سبەینێ بوش و بلێر و خوزی ماریا ئەزنار کۆبوونەوەی باڵا ساز دەدەن و ڕێگە بۆ شەڕ خۆش دەکەن. ماڵ هێوره و باخچە بێدەنگە و داروبار بێ جووڵەن، "عەلی، لەیلان، سیکۆ، حەسەن" سبەینێ دەچنە هەولێر، بەڵام عەلی دەیەوێت بگەڕێتەوە و لە کاتی هێرشکردنە سەر بەغدا لەگەڵماندا بێت، گومان دەکەم ڕێگەی بدەن تا بگەڕێتەوە، چونکە هەردوو ڕێگەی سەرەکی زۆر ناخۆشن، ژمارەیەکی زۆر ئۆتۆمۆبێل ریزیان بەستووە و خاڵەکانی پشکنین هەڵسوکەوتیان زۆر خراپە و بە شەش حەوت سەعات ئینجا دەگەن، وا مەزەندە دەکرێت لە چەند ڕۆژی داهاتوو ڕێگەکان دابخرێن، منداڵەکان بزر دەکەین، عەلی پاڵپشتم بوو و لە زۆر کاروبار یارمەتیی دەدام.

یەکشەمە (١٦)ی ئادار:

عەلی و لەیلان و سیکۆ و حەسەن سپێدەی ئەمڕۆ چوونە هەولێر، ماڵاواییەکە زۆر بەئازار بوو، سەرەڕای ئەوەی دەچنە شوێنێک ئاسایشی تێدا بەرقەرارە، بەڵام ڕوویان لە پاشەڕۆژێکی نادیار کردووە و نازانین کەی یەکتر دەبینینەوە، عەلی نیگەران بوو، لەو باوەڕەدا بوو مانەوەمان لە بەغدا مەترسییە، دەیوت دوای ئەوەی لەیلان و منداڵەکان بگەیەنێتە هەولێر ئەوا دەگەڕێتەوە لامان، بەڵام ئێمە مکوڕ بووین کە لای ئەوان بێت، چونکە گەڕانەوە بۆ بەغدا لەو بارودۆخەدا مەترسیدارە، ڕێگەی کەرکووک- هەولێر داخرابوو و لە هەر چرکەیەکیشدا ڕێگەی مووسڵ- هەولێر دادەخرێت، سەران لە هەولێرەوە تەلەفۆنی بۆ لەیلان کرد و داوای کرد بەزووترین کات بەغدا جێ هێڵێت، هەروەها ئامۆژگاریی کرد کە لەگەڵ عەلیدا زۆر

وریا بن بەتایبەتی لە کاتی پەرینەوە لە دوا خاڵی پشکنینی حکوومەتدا و خۆیان کۆنترۆڵ بکەن، چونکە هەڵسوکەوتی ئەفسەر و سەربازەکان زۆر نابەجێ و بێزارکەر بوو.

خەڵک پەلەیان دەکرد بۆ کڕینی خەڵووز تا ماسکی گازی سەرەتاییی لێ دروست بکەن، خەڵووزە هاڕاوەکە لەگەڵ خوێ تێکەڵ دەکرا و پەڕۆیەکی شەفافیان لەسەر دادەنا، لە کاتی بەکارهێنانی گازی ژەهراویدا پەڕۆکەیان بۆن دەکرد، ئەو ماسکانە سەرەتایی بوون، بەڵام ماسکی سەربازی لە بازاڕی مریدی لەلایەن عەسکەریەکانەوە دەفرۆشرا.

دووشەم (١٧)ی ئادار:

"لارا"م گەیاندە کۆلێج، فەرمانگەی پاسپۆرت خەڵکێکی زۆری بەدەورەوە بوو، هەندێک ڕێگە داخرابوون، خەڵک بە ترسەوە رایان دەکرد، هێزەکانی ئەمن لە کەربەلا، تەقەیان لە کەژاوەیەکی عاشوورا کرد، ناتوانین لەوە بگەین ئەم سەرکوتکردنە بەردەوام بێت، لە کاتێکدا لۆجیک دەڵێت پێویستە ڕێژیم هەموو توانایەک بەکار بێنێت تا گەل بەلای خۆیدا رابکێشێت، هەموو ئاماژەکان وا دیار دەخەن ڕێژیم چەند ڕۆژێکی دیاریکراوی ماوە.

نکاوێکی چاوەڕواننەکراو هاتە پێشەوە، عەلی لە هەولێر گەڕایەوە بەغدا و وتی ناتوانم لێرە بەتەنیا جێتان بهێڵم، وتی دوای ئەوەی هەولێری جێ هێشت هەموو ڕێگەکان داخران، ئێمە لەسەر گەڕانەوەکەی سەرکۆنەمان کرد و وتمان بوونی تۆ لەگەڵ ئێمە مەترسیی تێدایە.

ئەمڕۆ بەیانی گوێم لە بەرنامەی "نامەیەک لە ئەمەریکا"وەی ئالاستركوک لە رادیۆی (BBC) گرت، جاری یەکەم لە پەنجاکان یان لە سەرەتای شەستەکان گوێم لەو بەرنامەیە گرت، زمانی ئالاستركوک بەدەنگە خۆشەکەی زۆر پڕ چێژ بوو، لەو دنیا شێتەدا ئەو دەنگە ئۆکسجین بوو.

بڕیاری ئەمەریکایی- بەریتانیایی کێشرانەوە، پاش چەند سەعاتێک بوش وتارێک ئاراستەی گەلی ئەمەریکا دەکات، لە هەر چرکەیەکدا شەڕ رادەگەیەندرێت.

سێشەم (١٨)ی ئادار:

سپێدەی ئەمڕۆ، بوش سەدامی ئاگەدار کردەوە کە لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا عێراق جێ بهێڵێت، ترس لە گۆڕێیە و، بەڵام هیواش بەدی دەکرێت.

چوارشەم (١٩)ی ئادار:

بەغدا نیمچە چۆڵ کراوە، دیارە ئەمڕۆ دوا ڕۆژی بەر لە دەستپێکردنی شەڕە، سێ ماسکی دژ بەگازی ژەهراویمان لە دوکانێکی نیزیک گۆڕەپانی - الحرية-دا کڕی، هەروەها ئامێرێکی ئاگرکوژێنەوەشمان کڕی، شەم سەردانی کردین، کە ڕۆیشت لە پرمەی گریانی دا، بۆ دڵنیابوون سەردانی "هێنری"م کرد، وتی ئەمڕۆ بەیانی پۆستێکی لە - مریام-ی خوشکەزایەوە بەدەست گەیشتووە کە بریتییە لە هەندێک خواردنی لە قوتوونراو و چەند پارچە ڕۆژنامەیەک، هەروەها وتی زۆربەی کاتم بە کتێبەکەی حەنا بەتاتۆ "پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە عێراق" کە (٣) جزوبەندە بەسەر دەبەم.

پێنجشەم (٢٠)ی ئادار:

ڕۆژی یەکەم

سەعات پێنج و نیوی سەرلەبەیانی بەدەنگی شەیپووری ئاگەدارکردنەوە لە خەو ڕاپەڕین، چەند تەقینەوەیەکی بەدوا داهات، ئەمە ڕاگەیاندنی هێرشی وشکانی بوو، تۆپە تەیارەشکێنەکان دەنگیان هات، دوای چەند سەعاتێک بوش هاتە سەر تەلەڤزیۆن جاڕی دەستپێکردنی پرۆسە سەربازییەکانی دا، سەدامیش وتارێکی خوێندەوە کە چەند پارچە شیعرێکی بەخۆوە گرتبوو، لە دەرەوە چەند تەلەفۆنێکمان بۆ هات.

هەینی (٢١)ی ئادار:

ڕۆژی دووەم:

نەورۆزە و لە بەخت باشی خۆر دەدرەوشێتەوە، وەک هەموو ساڵان ئاهەنگی نەورۆزمان گێڕا، بەڵام ئەمساڵ بە سادەیی بوو و تەنیا پیرۆزباییمان ئاڵوگۆڕ کرد، لەبەر بۆردمان نەمانتوانی ئاگر بکەینەوە، سبەینێ زوو لە دەرگا درا، ئۆتۆمۆبێلی

زبڵڕێژ بوو، چەند شتێکی جوان بوو، کە ئەو جۆرە کارگوزارییانە بەردەوام بن، هێڵی تەلەفۆن کاری دەکرد و ئاو نەبڕا و ئۆتۆمۆبێلی زبڵڕێژ ئامادەیە، شتێکی گەورەیە، عەلی لەلای ئەو دوکانەی کە ماسکەکانمان لێ کڕی، هەندێک ژمارەی تەلەفۆنی پێویستی وەک ئۆتۆمۆبێلی فریاکەوتن و پۆلیس و بەرگریی شارستانی وەرگرتبوو.

ڕەمزی لە لەندەنەوە تەلەفۆنی کرد، بەزەحمەت گوێمان لە دەنگی دەبوو، چونکە باڵەفڕە بەچڕی وەزارەتی پلاندانانی لە کەڕادە مریەم و فەرمانگەکانی پشت ئەوێی بۆردمان دەکرد.

بەگوێرەی هەواڵی (BBC) هێزە هاوپەیمانەکان بە قووڵاییی ١٥٠کم هاتوونەتە باشووری عێراقەوە و دەستیان بەسەر ئوم قەسر داگرتووە، بەگوێرەی ڕاپۆرتی- جۆن سمیث- پەیامنێری (BBC) لە هەولێر هێزەکانی ئەمەریکا خەریکن دەست بەسەر کێڵگە نەوتییەکانی کەرکووکدا دەگرن، بەڵام ئەو هەواڵە لەلایەن هیچ سەرچاوەیەکەوە پشتڕاست نەکرایەوە، یەک لە تەقینەوەکانی دوێنێ لە نێزیک ماڵی - سهى الطريحي- بووە، بەڵام "سعاد الراضي" دەڵێت هیچ زیانی پێ نەگەیشتووە.

شەموو (٢٢)ی ئادار

ڕۆژی سێیەم:

لە سەعات ٨ی ئێوارەی دوێنێوە بۆردمانی ئاسمانی دەستی پێ کرد و تا بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی بەردەوام بوو، من و فائیزە و عەلی و لارا لە ژوورە بچووکەکەی تەلەفزیۆن لە نهۆمی خوارەوە بووین بێ ئەوەی بخەوین، بەگوێرەی هەواڵێکی (BBC) دوێنێ شەو ٣٢٠ مووشەک لە بەغدا دراوە واتە زیاتر لەو مووشەکانەی ماوەی شەڕی کەنداو.

سپێدەی ڕۆژی پاشتر وەرامی تەلەفۆنەکانمان دایەوە، ئاهەنگ، دادە، پوورە نەفیس لە هەولێر و نەوزاد لە پۆرتلاند تەلەفۆنیان کرد، پێمان وتن سەلامەتین، سەردانی- هێنری-م کرد، بینیم ئەو شووشەبەندەی کە دەڕوانێتە سەر شەقامەکە وردوخاش بووە، لەناو شووشەی وردوخاش دانیشتبوو، نازانم چی دەکرد، باش بوو – چاری – هات و بە هەرسێکمان هەندێک پارچە شووشەی گەورەمان کۆ

کردەوە و بەتێپ بەیەکەوەمان نووساند و بەکارتۆن بۆشاییەکانمان پڕ کردەوە، ئیشەکە سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام کاتی بوو.

یەکشەم (٢٣)ی ئادار

رۆژی چوارەم:

دیکران قەسابیان تەلەفۆنی کرد، دیاربوو تەندروستیی باش نەبوو، بەهۆی ئەو نەشتەرکارییەی بۆ - گرابێت-ی برای کرابوو دڵتەنگ بوو، فراقینی نیوەڕۆ خانەوادە بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، ئەحمەد لامان بوو، ئێوارە دەڕۆیشت و نیوەڕۆی رۆژی دوایی دەگەڕایەوە، دەستم بەخوێندنەوەی بایۆگرافی -ڤنگنشتاین- کرد، لەبەر بۆردمان؛ خوێندنەوە بەشەو مەحاڵە، بەرۆژ دەتوانی چەند سەعاتێک بخوێنیتەوە.

دووشەم (٢٤)ی ئادار

رۆژی پێنجەم:

بۆردمانی دوێنێ شەو زۆر چڕ بوو - رحاب - لە ئەمەریکاوە تەلەفۆنی کرد، من و فائیزە ئەم بەیانییە بۆ ماوەی سەعاتێک چووینە دەرەوە، ئۆتۆمۆبێلی ئەمن لە هەموو شوێنێک بوو، زۆربەی دوکانەکان داخرابوون.

ئەمەل تەلەفۆنی کرد وتی تەقینەوەیەک شووشەی پەنجەرەکانی ماڵەوەی وردوخاش کردووە ئەمەش لە ئەنجامی ڕاوەشاندنی رۆکێتێک بوو بۆ هەواڵگریی سەربازی بەرامبەر رووبار لە کازمیە.

هێزەکانی ئەمەریکا گەیشتنە کەربەلا، دەست بەسەر ئوم قەسردا گیرا، بەڵام بەسرە و ناسریە و نەجەف گەمارۆ درابوون و لە بەغدا دابڕابوون.

سێشەم (٢٥)ی ئادار

رۆژی شەشەم:

دوێنێ شەو چەند تەقینەوەیەکی ترسناک روویان دا سەرەڕای بۆردمان توانیمان مەراسیمی دابەشکردنی خەڵاتی ئۆسکار ببینین، ئولیڤیادی هاڤیلاند سەرکەوتووە دێرینەکانی پێشکێش کرد، ئەمە بیرەوەریی چلەکان و پەنجاکانی بەغدای بیر

خستمەوە، تا ئەمڕۆش ژیانمان زۆر ئاساییە، ئاو و کارەبا هەیە، هێڵی تەلەفۆن کار دەکات، رۆژ نا رۆژێک ئۆتۆمۆبێلی زبڵڕێژ دێت.

لە تەلەڤزیۆنی (BBC) دوکتۆر- "فازیل چەلەبی"مان بینی سیاسەتی نەوتی لە عێراق لە ماوەی دوای سەدام حوسێن شی دەکردەوە، هەموو پەنجەرەکانی ماڵی ئیحسان شێرزاد لە ئەنجامی بۆردمانکردنی بارەگەی هەواڵگریی سەربازی لەوبەری رووبارەوە وردوخاش بوون.

دوای فراڤین، کۆنگرەی رۆژنامەوانیی "تۆنی بلێر" و راپۆرتی رۆژانەی پرۆسە سەربازییەکان کە لەلایەن جەنەراڵ "فسنت بروکس"ەوە دەخوێندرایەوە بینی، دوای نیوەڕۆ گوێم لە (CD)ی بەدڵی خۆم گرت کە فوئادی برام کاتێک سەردانی "ئۆپرن"م کرد پێشکێشی کردم، "کاپلن باتل" گۆرانییەکانی هاندل (Handel ar-ias)ی دەچڕی، کامل شبیبی و خوشکەکەی ماڵەکەیان جێ هێشت، لەو باوەڕەدا بوون جادریە شوێنێکی ئەمین نییە.

چوارشەم (٢٦)ی ئادار

رۆژی حەوتەم:

شەوێکی ترسناک و بۆردمان بەردەوام بوو، وێستگەی تەلەڤزیۆنی عێراق لێ درا، چەند راپۆرتێکی نادڵنیا باس لە راپەڕینی بەسرە دەکەن، خۆڵباران کەم بووە، دارەکان بەخۆڵ و تۆزێکی قاوەیی کاڵ داپۆشرابوون، دیمەنێکی خەماوی بوو.

دایکی زینە سەعات (١٠)ی بەیانی هاتە لامان، لەوەتەی ئاشوور جێی هێشتووین رۆژانە دێتە لامان، دوو پیاو لە دەرگەیان دا و وتیان دارخورما دەبڕنەوە؟ وتمان بەڵێ، لەگەڵ دراوسێیان قسەمان دەکرد، هەموو گەشبین بووین، بەڵام بەجۆرە نیگەرانییەکەوە.

پێنجشەم (٢٧)ی ئادار

رۆژی هەشتەم:

موعتەزە و هالەی کچی، دوێنێ شەو تەلەفۆنیان کرد، لەو بارودۆخەدا موعتەزە چۆن دەتوانێت لە چارەسەرکردنی کیمیاوی بەردەوام بێت بەڕاستی کارەساتە، لەنجە و نەرمین لە ئەمەریکا و کارا لە هۆڵەندا و نەجاتی لە هەولێرەوە تەلەفۆنیان

کرد، دوکتۆر هاشمیش تەلەفۆنی کرد، دایکی زینە وتی خانوویەک کە پیاوانی ئەمن خۆیان تێدا شاردبووەوە بە بۆمبی دەستی هێرشی کراوەتە سەر و هێرشبەران ئۆتۆمۆبێلێک چاوەڕوانی کردوون و ڕایان کردووە، هەروەها وتی ئەو هێرشبەرانە یا پیاوانی بەرگری بوون یاخۆ خەڵکانێک بوون لە ژیان بێزار بوون، هەر کاتێک گوێ لە (Magic Flute) دەگرمەوە ئەو بڕوایەم لەلا زیاد دەبێت کە ئەمە مەزنترین ئۆپێرای مۆزارتە، دەنگی هرمان بری لە ڕۆڵی کینۆ زۆر نازدارە.

هەینی (٢٨)ی ئادار:

ڕۆژی نۆیەم:

لە نێزیک گۆڕەپانی - الحرية- بەدالەی تەلەفۆناتی جادریە بۆردمان کرا، لە ئەنجامدا هێڵەکان پەکیان کەوت، عەلی بەمە زۆر دڵگران بوو، چونکە ڕۆژانە تەلەفۆنی بۆ لەیلان دەکرد، پێمان وت شوێنی لەیلان و منداڵەکان ئەمینە و وا لە هەولێرن و پێویستی بەنیگەرانی نییە، نرخی خواردەمەنی دووقات بەرز بووەوە.

شەموو (٢٩)ی ئادار

ڕۆژی دەیەم:

ئاماژەکان وا پێشان دەدەن، کە شەڕ لە وادەی پلان بۆدارێژراوی زیاتر دەخایەنێت، گاردی کۆماری پەنا بۆ شەڕی چەتەگەری دەبات، دیارە جۆرە لەسەرخۆییەک لەلایەن ئەمەریکاییەکانەوە بۆ هاتنە ناو بەغدا هەیە، ئەمەریکاییەکان دەڵێن هیچ گۆڕانکارییەک لە پلانەکەدا نییە، بگرە هەڵسەنگاندنی دەسکەوتەکانە، کوشتنی خەڵکی سڤیل لە شوعلە کارەسات بوو، دابەشکردنی یارمەتی لە ئوم قەسر لەلایەن هاوپەیمانانەوە هەرا و هۆریای پێوە دیاربوو، ئەوانەی بەهێز بوون بەشی خۆیان وەردەگرت، پیر و لاوازەکانیش لە ریزی دواوە هیچیان بەرنەدەکەوت، دیمەنی ئەمڕۆ جیاوازە، چونکە خەڵک بەرێکی سرەیان گرتووە.

ڕەحیم ماڵیان لە کەڕەکی سەدامە، ئەمڕۆ زوو هات، وتی ژیان لەوێ ئاساییە و کارگوزاری هەیە و هێڵەکانی تەلەفۆن کار دەکەن و لە جادریە باشترە، وتی ئامادەیە ئۆتۆمۆبێلەکان بشوات، وتمان عەباس نیوەڕۆ دێت و دەیانشوات.

یەکشەم (٣٠)ی ئادار:

رۆژی یازدەم:

لە سەتەلایتی ئەبوزەبی، کۆبوونەوەیەکمان بینی کە لە لەندەن ساز درابوو و عەدنان پاچەچی سەرۆکایەتیی دەکرد، لە نێوان ئامادەبوواندا رەفعەت چادرچی و فازیل چەلەبیمان بینی.

کاتێک بۆ کوژاندنەوەی گڵۆپەکان بەیانی زوو چوومە ناو باخچەکە باڵندەیەکی غەریبم بینی، کە هەر هێندەی کۆترێک دەبوو، فائیزە کە باڵندەکەی بینی وتی لە ئەنجامی بۆردمان ئەو باڵندەیە هەرەتە بووە، ئەمە تەنیا لە ناوچەی شاخاویدا دەژی و لە شوێنی گەرم هەڵناکات.

ئینتەرنێت و هێڵی تەلەفۆن نەمان، تاکە سەرچاوەی زانیاریمان هەواڵی رادیۆ و سەتەلایتە، ئەگەر سەتەلایت لە ماڵەوە بدۆزرێتەوە لەلایەن ئەمنەوە مەترسیمان بۆ دروست دەکات، پێشتر بە ٤٠٠ هەزار دینار و بردنی ئامێری سەتەلایتەکە سزا دراین، ئەگەر ئەمجارە بیدۆزنەوە، بێگومان دەمانبەنە گرتیگە.

دوای چەند سەعاتێک گەڕان ئەو (CD)یانەم دۆزییەوە کە شەهرەزاد قاسم حەسەن پێش ساڵێک لە پاریسەوە بۆی ناردبووم، (CD)یەکان مەقاماتی عێراقی بوون، شەهرەزاد بە فرەنسایی و ئینگلیزی لەناو بەرگی (CD)یەکان شرۆڤەی نووسیبوو، ئەو سەردانەی شەهرەزادم بیر ناچێتەوە، کە لە کۆتاییی نەوەتەکاندا هاتە مەرقەدی گەیلانی و هاشم رەجەبیش هاوەڵی بوو تا گوێ لە خوێندنەوەی مەولوود بگرن، ئەو مەولوودانە بەدەنگێکی کاریگەر و خۆش دەخوێندرانەوە، وەرچەرخانی شەهرەزاد قاسم حەسەن لە موزیکی کلاسیکییەوە، کە لە پاریس خەریکی خوێندنی بوو بۆ مەقاماتی عێراقی و لێ تۆژینەوە لەو بوارە شتێک بوو جێگەی سەرسوڕمان بوو.

دووشەم (٣١)ی ئادار:

رۆژی دوازدەم:

لە تەلەڤزیۆن "بوش"مان بینی کە لە فیلادلفیا قسەی بۆ پاسەوانانی سنوور دەکرد، کامل شەبیبی دانی عەسرێ لای ئێمەی بەسەربرد، وتی تاریق عەزیز "نەک

ئەو تاریق عـــەزیزەی کـــە جـــێگری ســـەرۆک وەزیرانە" کـــە ئەندازیاری نەوتە و خـانەنشـینـە دراوسـێی منە، گـوللـەتۆپێکی باڵەفـڕشـکێن کـەوتووەتـە سـەربـانی خانووەکەیان و لەو بارودۆخەدا نازانێت چۆن ئەو کونە گەورەیە پڕ بکاتەوە.

سێشەم (١)ی نیسان:

ڕۆژی سێزدەم:

هێزە هاوپەیمانەکان، شاری هیندیەی باشووری بەغدایان داگیر کرد، وا دیارە ئەو هێـزانـە زۆربەی شـارە سـەرەکـییـەکـانی بـاشـووریان کـۆنتـرۆڵ کـردووە و لە پێشڕەوی بەرەو بەغدا بەردەوامن.

بە ڕووداوێکی دڵتـەزێن لە ناسریە ٧ ژن و منداڵ کـوژران، پاسـەوانەکـەمـان وتی کـادیرە حزبییـەکـان لە خانووە چۆڵکراوەکاندا خـۆیان شـاردووەتەوە، هەروەهـا وتـی گـوللـەتۆپێکی باڵەفـڕشکێن لە گـەڕەکی شـەعب بەر مـاڵێک کـەوتووە و هەمـوو دانیشتوانەکەی کوشتووە، چوومە سەردانی نووری مستەفا بەهجەت لە مەنسوور، وتی ڕۆژی ئـەوڕۆم بە گـوێگرتن لە مـۆزارت بەسـەربـردووە، بـاشـتـرین ڕێگە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بۆردمان گوێگرتنە لە موزیک.

چوارشەم (٢)ی نیسان:

ڕۆژی چواردەم:

بۆردمـان بەچڕی بەردەوامـە، دیمەنی کـوژراوەکـانی حیللە زۆر دڵتـەزێن بوو، لە دیوانیـە و کـوت و کـەربەلا شـەڕە، پێشـڕەوی بەرەو بەغـدا بەردەوامـە، هێزەکـانی ئەمەریکا ١٩ میل لە باشووری بەغداوە دوورن.

پێنجشەم (٣)ی نیسان:

ڕۆژی پازدەم:

وەزیری دەرەوەی ئەڵمـانیـا ڕای گـەیانـد، کە هـیـوادارە ڕژێمی عێـراق بەزووترین کات بڕووخێت تا گیانی هاووڵاتییە عێراقییە بێ گوناهەکان ڕزگار بکرێت، ئـەمە گۆڕانکارییەک بوو لە هەڵوێستی ئەڵمانیا.

مـحـەمـەدی پاسـەوان وتی: "رضـوانیـة" دەسـتـی بەسـەردا گـیـرا، کـارەبا بڕا و

شەوەزەنگە، هانامان بۆ مۆم و لەمپا بردەوە، ئێمە رۆژی دووجار بۆ ماوەی ٤ سەعات موەلیدە بچکۆلەکەمان پێ دەکەین تا بەیاننامەی رۆژانە لەبارەی پرۆسەی سەربازییەکانەوە کە لەلایەن جەنەراڵ – ڤنسنت بروکست- دەخوێندرایەوە بەسەر بکەینەوە.

هەینی (٤)ی نیسان:

رۆژی شازدەم

دەست بەسەر باڵەفرگەی نێودەوڵەتیی سەدامدا گیرا و ناوەکەی بوو بە باڵەفرگەی نێودەوڵەتیی بەغدا، کۆشکی کۆماری تەنیشت باڵەخانەش دەستی بەسەردا گیرا، گوڵی رەنگ زەردی جوان لە باخچەکەدا دەبینم.

شەموو (٥)ی نیسان:

رۆژی حەڤدەم:

عەلی ساحیب قاموسی دوێنێ شەو سەردانی کردین، وتی ناچارە عامریە جێ بهێڵێت و بچێتەوە ماڵی باوکی لە جادریە، چونکە گاردی کۆماری ناوچەکانی نێزیک باڵەخانە چۆڵ دەکات، گاردی کۆماری بەچڕی لە ناوچەی باشووری رۆهەڵاتی بەغدا گرد بوونەتەوە، چونکە وا مەزەندە دەکەن هێزەکانی ئەمەریکا لە پارێزگای – کوت-ەوە بێن، لەو حاڵەتەدا شاری سەدام دادەبڕێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی بەغدا ببێتە دوو بەش تا بە ئاسانی شارەکە کۆنترۆڵ بکرێت.

یەکشەم (٦)ی نیسان:

رۆژی هەژدەم:

بەدرێژاییی شەو و بێ برانەوە بۆردمان بەردەوام بوو، گاردی کۆماری لە گۆڕەپانی کەمال جونبلات گرد بوونەتەوە و هەروەها لە بەردەم دەروازەی زانکۆی بەغدا دەبینرێن، هەندێک دراوسێ دەڵێن ئەمەریکاییەکان گەیشتنە دۆرە، ئەمرۆ بەیانی دایکی زینە نەهات، وادیارە دوای چەند رۆژێکی کەم هێزەکانی ئەمەریکا دێنە سەر شەقامەکانی جادریە.

دووشەم (٧)ی نیسان:

ڕۆژی نۆزدەم:

کوشتارێکی توند، تەقینەوەکان جادریەیان هەژاند، خەڵک لەماڵەکانیان گەمارۆ دراون، دەبابەکانی ئەمەریکا بەرامبەر هوتێل ڕەشید و نەخۆشخانەی یەرمووکن، جەواد غالی ماڵەکەی لە ئێمەوە نێزیکە و شەقامیش ئۆتۆمۆبێلی بەسەرەوەیە، بە پیاسە هاتە لامان تا دڵنیا بێت، جەواد وتی لەگەڵ کوڕەکەی لە شەقامی فەلەستین دەبابەیەکی عێراقیی بینیوە.کە دوو سەربازی عێراقیی بەسەرەوە بووە، بە قسەی جەواد سەربازەکان منداڵ بوون و ویستوویانە خۆیان بشارنەوە، خەڵکەکە کاتێک زانییان ئەو دوو سەربازە گاردی کۆماری نین و سەربازی نیزامین خواردن و چایان بۆ بردن و پێیان وتن شوێنەکە جێ بهێڵن، جەواد غالی بە ورەیەکی بەرزەوە گەڕایەوە جادریە.

سێشەم (٨)ی نیسان:

ڕۆژی بیستەم:

بۆردمانێکی چڕ، دەبابەکانی ئەمەریکا لەسەر پردی - الجمهورية-ن و سەنتەری شار دەستی بەسەردا گیرا، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی عێراق لە وەشان کەوت، دەیان کوژراو و بریندار، نەخۆشخانەکان ناتوانن پێشوازیی ئەو ژمارە زۆرە بکەن، نوژدارەکان بێ ڕاوەستان و پشوودان نەشتەرکاری دەکەن و هەندێک جار بەنجیش بەکار ناهێنن، دەرمان کەمە و باروودۆخەکە تراجیدییە، بەلای کەمەوە حکوومەت لە جادریە رووخاوە، دایەرەی ترسناکی ئەمن بە دووریی سێ شەقام چۆڵ کراوە، ئەفسەر و کارمەندانی هەڵاتوون و ئۆتۆمۆبێل و ئامێرەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە، هەروەها گاردی کۆماری و فیداییەکانی سەدام دوای ئەوەی جلی سەربازی و چەکەکانیان فڕێ داوە هەڵاتوون، لە جادریە کارەبا و تەلەفۆن و ئاو نییە، سەرجەم دوکانەکان داخراون، تەنانەت نانەواخانەکەی تەنیشت هۆتێلی بابل، لە ماڵەوە خواردنێکی کەم ماوە، دایکی زینە و عەباسی پاسەوان و برایەکەی نەهاتن، ئۆتۆمۆبێلی زبڵڕێژیش نەهات، ئەوەی زیاتر نیگەرانیی کردووین ٣ ڕۆژە ئەحمەدمان نەبینیوە، هەموو پەردەکان داخراون.

چوارشەم (٩)ی نیسان:

رۆژی بیست و یەکەم:

بەیانی:

بۆ یەکەم جار شەوێکی هێمن بوو، بەرەبەیان دەنگی هەندێک تەقە هات، ئەمەریکییەکان مەڵبەندی بەغدایان کۆنترۆڵ کرد و لەلای ڕۆهەڵاتەوە شاری سەدام بۆردمان دەکەن، هۆتێلی فەلەستین مێریدیان، کە هەموو رۆژنامەنووسانی تێدایە بە دەبابەی ئەمەریکایی گەمارۆ دراوە.

عەسر:

خەڵک لەسەر شەقام ڕادەکەن و هوتاف لێ دەدەن، دیمەنێکی یەکجار دەگمەنە، بەربەستی ترس نەما، هەزاران کەس لە گۆڕەپانی فیردەوس ئاهەنگ دەگێڕن، پەیکەری سەدام رووخا و ملیۆنان مرۆڤ لە سەرتاپای جیهان لە تەلەڤزیۆن ئەو ڕووداوەیان بینی، رووخانی پەیکەرەکە وەک رووخانی گرتیگەی باستیل و دیواری بەرلین وابوو.

پێنجشەم (١٠)ی نیسان:

رۆژی بیست و دووەم:

رۆژێکی ترسناک و تژی لە هەراوهۆریا و تالان و برۆ، جگە لە ماڵی گەورە بەرپرسانی ڕێژیم هەروەها وەزارەت و زانکۆ و نەخۆشخانە و هەندێک ئاژانسی نەتەوە یەکگرتووەکان و باڵوێزخانەی بیانی و مەڵبەندی رۆشنبیریی فرەنسایی و ماڵی هەندێک هاووڵاتی کە دژی ڕێژیمی پێشوش بوون تالان و برۆ کران، کارەساتەکە لەوەدا بوو مۆزەخانەی عێراق کە تژی بوو لە گەوهەری کەلەپووری کۆنی عێراق و شارستانیەتی سۆمەر و بابل و ئاشوور تالان کرا، کتێبخانەی نیشتمانی کە بە هیچ نرخێک نەدەخەمڵێندرا تالان کرا و دوایش سووتێندرا، ئەمانە بە هیچ قەرەبوو ناکرێنەوە.

لە جادریە، وەک شوێنەکانی تری بەغدا، لاوانی ناوچەکە بەنۆرە ئەرکی پاراستنی ماڵەکانیان بە ئەستۆوە گرت، دوێنێ شەو گوێمان لە هەندێک تەقەی نێزیک بوو دوایی زانیمان دزەکان لە نێوان خۆیاندا بەشەڕ هاتوون، بارودۆخ وەک

بۆردوومانی باڵەفرە تۆقێنەرە.

نکاوێکی خۆش بوو، دوای چەند رۆژێک ئەحمەد گەڕایەوە و لە باوەشمان گرت، فائیزە لە خۆشییان گریا، ئەحمەد رێگەیەکی دووری گرتبووە بەر، لە پردی ئەعزەمییە، کە تاکە پرد بوو دانەخرابوو پەڕیبووەوە تا گەیشتبووە جادریە، ئەحمەد وتی لە کاتی گەڕانەوەی بۆ جادریە بە خاڵێکی پشکنیندا تێپەڕ بوو، کە هی فیداییەکانی سەدام بووە، دیارە تا ئێستا هەندێک شوێنی بەغدا لەژێر دەسەڵاتی حکوومەتدایە، مووسڵ دەستی بەسەردا گیرا، لە نەجەف مەجید خوئی کوژرا، ماوەی دوای شەڕ رووداوێکی دڵتەزێن و سەرەتایەکی خراپ بوو.

هەینی (١١)ی نیسان:

رۆژی بیست و سێیەم:

شەوێکی هێمن:

بە ئۆتۆمۆبێل، من و عەلی و لارا پیاسەیەکمان کرد و بەدوای سەمووندا دەگەڕاین، نانەواخانەکان هەموو داخرابوون، لە بەردەم نەخۆشخانەی راهیبات و زانکۆی بەغدا دەبابەی ئەمەریکاییمان بینی بۆ پارێزگاریکردن، هەرچەندە درەنگیش بوو، بەڵام کارێکی داواکراو بوو، لە تەلەفزیۆن ئەمەریکاییەکانمان بینی چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەفسەرانی پۆلیس دەکرد، وادیارە هەوڵێک لە ئارادایە و لەبەر رۆشنایی ئەو هەراوهۆریایەدا ئەفسەرە پۆلیسە نابەعسییەکان بگەڕێننەوە سەر کار.

شەموو (١٢)ی نیسان:

رۆژی بیست و چوارەم:

لە زۆربەی ناوچەکاندا، لەلایەن دانیشتوانەوە بەربەست دانراوە تا خۆیان و موڵک وماڵیان لە تالانچییە درندەکان بپارێزن.

نەجاتی لە هەولێرەوە هات و وتی رێگەی بەغدا- هەولێر بۆ ئۆتۆمۆبێل کراوەتەوە، عەلی بریاری دا ئەو هەفتەیە بچێتە هەولێر تا لەیلان و منداڵەکان بهێنێت، نرخی خواردەمەنی چوارقات بەرز بووەتەوە بە تایبەتی لەوەتەی شەڕ دەستی پێ کردووە، ئەو مادانە لە توانای کڕینی کەسی ئاساییدا نییە.

یەکشەم (١٣)ی نیسان:

ڕۆژی بیست و پێنجەم:

سەعات ٣ی بەیانی دەنگی هاوار و تەقە دەهات، دیاربوو خەڵکی ناوچەکە ڕاوەدووی دزانیان نابوو، پۆلیسی عێراقی شان بەشانی هێزەکانی ئەمەریکا لە خاڵەکانی پشکنین بەدیارکەوتن، یانەی- العلویة- بۆ تەجنیدی پۆلیسان تەرخان کرا.

بەرەنگاربوونەوەی تاوانباران لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە کاریگەری خۆشی سەلماند، ئەوان تاوانباران دەستگیر دەکەن و ڕادەستی هێزەکانی ئەمەریکایان دەکەن، شتە دزراوەکانیش لە مزگەوت یان حوسەینیە کۆ دەکرێنەوە و پاشان دەدرێنەوە بەخاوەنەکانیان شەڕ لە نێوان دانیشتوانی گەڕەکی سەدام و چەکدارانی لە دەرەوەی عێراق هاتوو هەیە، تکریت دەستی بەسەردا گیرا و حەوت سەربازە ئەمەریکاییە ڕفێندراوەکە ئازاد کران، مام جەلال چاوی بە نوێنەرانی عەرەب و تورکمانی کەرکووک کەوت.

دووشەم (١٤)ی نیسان:

ڕۆژی بیست و شەشەم:

کۆمەڵگەی عێراقی، فرەرەنگ و نەتەوە و ئاین و ئاینزایە، ئەم جیاوازییە بەهێزییە نەک لاوازی، بەڵام ئەگەر دەوڵەت سیاسەتێکی هەڵە پیادە بکات ئەوا ئەم جیاوازییە دەبێتە لێکترازان و تەنانەت شەڕی ناوخۆش، دەستم بەخوێندنەوەی کتێبی "ململانێی شارستانییەکان و ڕێژیمی جیهانی" ساموئیل هندکتن کرد، کتێبەکە جەخت لەسەر ئەو بنەمایە دەکاتەوە کاتێک ڕۆڵی ئایدیۆلۆجیاکان کۆتایی دێت ئاینەکان ڕۆڵی کاریگەر دەبینن و دەڵێت: "دەوڵەتێک، کە دەوڵەتێکی تر داگیر دەکات بە ئیمپریالیزم وەسفی دەکەن و هەندێک جاریش بە گەل داگیر کردن، ئەمەش پشت بە ناسنامەی دەوڵەتی داگیرکەر و ئەو ماوە مێژووییە دەبەستێت کە داگیرکردنەکەی تێدا کراوە".

سێشەم (١٥)ی نیسان:

ڕۆژی بیست و حەوتەم:

کۆبوونەوەی هێزە بەرگریکارە عێراقییەکان لە ناسریە.

چوارشەم (١٦)ی نیسان:

ڕۆژی بیست و هەشتەم:

مەیدانی فیردەوس لە گۆشەی وتاربێژانی باخچەی- هایدپارک- دەچێت، لە کاتێکدا گۆشەی وتاربێژانی هایدپارک بە پلەی یەکەم وتاری سیاسی بەخۆوە دەگرێت، بەڵام گۆڕەپانی فیردەوس فرە چالاکیی تێدایە، جگە لە وتارە سیاسییەکان، دیمەنێکی دڵتەزێنم بەرچاو دەکەوێت ئەمیش کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆری هاووڵاتییانە، کە داوای زانیاری سەبارەت بە کەسە ونبووەکانیان دەکەن، هەیە لە باوکی دەپرسێت ئەوی تر لە مێردی و باوک دەیەوێت بزانێت کوڕەکەی چی بەسەرهاتووە.

خۆپێشاندان بۆ گەڕانەوەی کارگوزاریی کارەبا و ئاو و حوکمی یاسا و ئاسایش دەکرێت، خۆپێشاندەران دەیانەوێت بۆ سەر کارەکانیان بگەڕێنەوە، هی تریش (سی ڤی)ی خۆی لایە و بەدوای کاردا دەگەڕێت.

مەیدانی فیردەوس بزاڤی بازرگانیشی تێدایە، بازاڕێکی بووژاوەیە بۆ کڕینی بەنزین و نەوت و جگەرە، بە نرخێکی خەیاڵی دەتوانێت تەلەفۆن بۆ دەرەوە بکەیت.

لەو مەیدانەدا، کەسانی خۆهەڵقورتێنەر هاتوون و دەیانەوێت قسە بۆ ڕۆژنامەنووسان بکەن، ماوەی سی ساڵە عێراقییەکان لە گرتیگەیەکی گەورەدا ژیان بەسەردەبەن، ڕاوەدوو دەنران لە ناکاو لە شەو و ڕۆژێکدا خۆیان لە بۆشاییەکی کوشندەدا دۆزییەوە، وڵاتێکی بێ حکوومەت و پۆلیس و سوپا و چاودێری و ڕێنوێنی و یاسا، لەو بارودۆخەدا بەهێز کۆنترۆڵ دەکات و لاوازیش دەپلیشێتەوە، پیاوێک لەو مەیدانەدا هاواری کرد "ئێمە ئازادین"، بۆی هەیە ئەو قسەیە ڕاست بێت، بەڵام وتە کاریگەرەکەی -- جۆرج ئۆرویل" لە ڕۆمانی بەناوبانگی - باخچەی ئاژەڵاندا:

.All animals are equal but some are more equal than others

ئەم دەستەواژەیەی ئۆرویل بەتەواوی لەسەر بارودۆخی عێراق پراکتیزە دەبێت، راستە عێراقییەکان ئێستا سەربەستن بەڵام هەندێکیان لە هەندێکیان سەربەستترن.

پێنجشەم (١٧)ی نیسان:

رۆژی بیست و نۆیەم:

سەردانی - ئەمین عەبدولکەریم-م کرد، خانووەکەی بەرامبەری و باڵوێزخانەیەکی بیانیی دراوسێیان تالآن کرا، ژنەکەی و تەمارای کچی و ئیبراهیمی کوڕی لە بارودۆخێکی تۆقێنەردا بوون، ورەی ئەندامانی خێزانەکە لە رۆژانی یەکەمەوە تەمارا، بەرامبەر دیمەنی تالآن و بڕۆ گەشبینیی نەما.

هەینی (١٨)ی نیسان:

رۆژی سییەم:

وڵاتە یەکگرتووەکان بە نیازی پێشکێشکردنی پێشنیازێکە تا ئابڵووقەی ئابووری لەسەر عێراق لابچێت، مەهزەلەکە لەوەدایە هەندێک ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایش حەز ناکەن ئابڵووقەکە لابچێت.

ئاهەنگ و تەوار لە هەولێرەوە هاتن و وتیان ڕێگەی بەغدا- هەولێر بۆ ئۆتۆمۆبێل ئاساییە، بڕیاریان دا سبەی بگەڕێنەوە و "عەلی"یش هاوەڵیان بێت. شیعە و سوننە لە خوتبەی رۆژی هەینیدا داوای یەکەتی و ئاشتبوونەوەی نیشتمانییان کرد.

دوا قسە کە لە بەغدا خەڵک دەیانکرد تالآنکردنی باخچەی ئاژەڵان بوو وەک زۆربەی شوێنە گشتییەکان، هەندێک لە ئاژەڵەکان دزران و هەندێکیشیان ئازاد کران، شێر و پڵنگ بێ خواردن لە قەفەسەکانیاندا مانەوە.

شەموو (١٩)ی نیسان:

رۆژی سی و یەکەم:

بۆ یەکەم جار، جەنەراڵ تۆمی فرانکس هاتە بەغدا، بارودۆخ وردە وردە جێگیر دەبێت بەتایبەتی لە ڕووی ئاسایشەوە، هەندێک دوکان کراونەتەوە، خانەوادەکان

بەدوای کەسە ونبووەکانیان لە نەخۆشخانە و گۆڕە کاتییەکاندا دەگەڕێن و ئاهەنگ و عەلی و تەوار ئەمڕۆ بەیانی گەڕانەوە هەولێر.

یەکشەم (٢٠)ی نیسان:

ڕۆژی سی و دووەم:

دوکتۆر وەلید هاشمی و دوکتۆر نووری مستەفا بەهجەت سەردانیان کردین، زۆر بەو دیدارە دڵشاد بووین، دوکتۆر نووری وتی چووەتە یانەی - الصید- لە مەنسوور و پرسیاری کردووە ئاخۆ دەتوانێت یاریی تێنس بکات بەو سیفەتەی سی ساڵ ئەندامی ئەو یانەیە بووە، کوڕێکی تفەنگ بەدەست لە دەروازەکە راوەستاوە و پێی دەڵێت: "ئینشاڵڵا، بەس ئەمڕۆ نا"، کاتێک ماڵاواییان کرد وتیان لە ماڵەکەیدا سەردانی - امل الخضیري-یان کردووە و زۆر ئازاری هەبووە، هەروەها وتیان - البیت العراقي-ش تاڵان کراوە و سووتێندراوە.

دووشەم (٢١)ی نیسان:

ڕۆژی سی و سێیەم:

جەنەراڵ- جەی گارنەر- گەیشتە بەغدا، لە کەناڵێکی ئاسمانیی عەرەبیدا دیمەنی چەند عێراقییەک هاتە پێشاندان کە ئاسەواری ئازاردانیان پێوە دیاربوو، دیمەنەکان تۆقێنەر بوون، لاوێک گوێی بڕابوو.

سێشەم (٢٢)ی نیسان:

ڕۆژی سی و چوارەم:

جەنەراڵ جەی گارنەر سەردانی هەولێر و سلێمانیی کرد، کارەبا گەڕایەوە هەندێک ناوچەی بەغدا، بەڵام جادریەی تێدا نەبوو.

چوارشەم (٢٣)ی نیسان:

ڕۆژی سی و پێنجەم:

من و فائیزە چووینە - صلیخ- تا سەردانی سوعاد و مونیرە و ئەمەل بکەین، سوعاد وتی کۆمەڵە چەکدارێک هەوڵیان داوە دەست بەسەر خانووە کۆنەکەی

حیکمەت سلێمـاندا بگرن کە بارەگەی – الجمعیة البغدادیة – بوو، ناچار بووە هـانا بۆ سـەرکردەیەکی ئەمـەریکایی ببات کە بارەگاکەی لە کۆلێجی بەغدا بووە، داوای لێ کردووە خانووەکە بپارێزێت، ئەمەریکاییـیەکە بە گوێی کردووە، هـەروەهـا سوعاد وتی دوای ئەوەی ئەمـەریکاییـیـەکە مـاڵەکەی رزگـار کـرد پێم وتووە "دەزانی حـەز لە چارەتان ناکـەین؟"، ئەمـەریکاییـیـەکە بە هـەمـوو رێزێکەوە وەرامی داوەتەوە (ئـەمـە دەزانم).

(BBc) چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئەمەلدا کرد، دراوسێکان زەردەیان بۆ ناردین.

پێنجشەم (٢٤)ی نیسان:

ڕۆژی سی و شەشەم:

عـەلی، لەیلان، سیکۆ لە هـەولێر گـەڕانەوە، ژیانێکی تازەیان بە مـاڵەوە بەخـشی، دیارییـەکی نایابیشـیان لەگـەڵ خـۆیاندا هێنابوو کـە "الحـجـمة السـوداء" دۆنبـەڵان و پەنیر بە ژاژی بوو، کارەبا هـاتەوە.

هـەینی (٢٥)ی نیسـان:

ڕۆژی سی و حەوتەم:

عومەر سـالم دەملوەجی هـاتبـووە مـاڵ، بەڵام من لەوێ نەبووم، بە فـائیزەی وتبـوو کە مەی حەیدەری لە کاتی تێپـەڕبوونی، بە خـاڵێکی پشکنیندا دیارە ڕانەوەستاوە و تەقـەیان لێ کردووە و کوشـتوویانـە، بەبیسـتنی هـەواڵەکە شـپرزە بووم، بیـرەوەریی ڕۆژانی بەغدا و گەشتەکانی وەرکام هـاتەوە بیر.

شەموو (٢٦)ی نیسـان:

ڕۆژی سی و هـەشتەم:

هـانیە بۆ یەکەم جار هـاتە بەغدا.

یەکشـەم (٢٧)ی نیسـان:

ڕۆژی سی و نۆیەم:

لە ئەنجامی تەقینەوەی چەکی شاراوە لە زەعفەرانیە ٨ کەسی سڤیل مردن.

دووشەم (٢٨)ی نیسان:

ڕۆژی چلەم:

یەکەم کۆنگرە لە بەغدا بۆ هەموو حزبە سیاسییەکان بەسەرۆکایەتیی جەی گارنەر بۆ پێکهێنانی حکوومەتی کاتیی عێراقی ساز درا.

سێشەم (٢٩)ی نیسان:

ڕۆژی چل و یەکەم:

بوش لە کۆنگرەی هاووڵاتییە ئەمەریکاییە بە ڕەگەز عێراقییەکان لە شاری دیربورنی ویلایەتی میشیگان وتارێکی خوێندەوە و وتی ئێمە کولتووری ئەمەریکا بەسەر عێراقدا فەرز ناکەین، ئەو حکوومەتەش دانانێین کە خۆمان دەمانەوێت بگرە کارەکە بۆ عێراقییەکان جێ دەهێڵین تا خۆیان حکوومەت هەڵبژێرن، هەروەها وتی ئابڵووقەی ئابووری لەسەر عێراق لادەچێت.

ئەو کۆنگرەیەی کە جەی گارنەر سەرکردایەتیی دەکرد ٣٠٠ کەسایەتیی عێراقیی تێدابوو کە نوێنەرایەتیی سەرجەم پێکهاتەی عێراقییەکان لە ڕووی سیاسی و نەتەوەیی و ئاینی و ئاینزاییی دەکرد، کۆنگرەکەی ڕاسپارد کە حکوومەتێکی کاتیی عێراقی لە ماوەی ٣-٤ هەفتە پێک بهێندرێت، هەروەها پاڵپشتیی هێزەکانی ئەمەریکای لە عێراقدا کرد.

ئەمڕۆ لە لەندەن کۆبوونەوەیەک ساز دەدرێت لە نێوان یونسکۆ و مۆزەخانەی بەریتانیایی کە تێیدا ئارکیۆلۆجی و شارەزا جیهانییەکان ئامادە دەبن تا ئەو کارانە بۆ ڕزگارکردن و گەڕانەوەی کەلەپووری عێراقی ئەنجام بدەن، بێگومان سەلما ڕازی و لەمیا گەیلانی لەو کۆبوونەوەیە ئامادە دەبن.

هانیە داوای کرد بیبەینە لای نەجلە گەیلانی لە "صلیخ"، ئەمە لەسەر ڕاسپاردەی دایکی هانیە بووە تا لە عەمانەوە بەهۆی ئامێری سوڕەییای هانیە قسە لەگەڵ براکەیدا بکات، بینیمان نەجلە لە پەلوپۆ کەوتووە و ئاسەواری شەڕ و نەخۆشی بە ڕوونی پێوەی دیارە، گومانی لەوە هەبوو داودەرمانەکەی لە بەغدا پەیدا بێت، هانیە وتی سبەینێ سەفەر دەکات و لە عەمان دەرمانی بۆ دەنێرێت.

لەو سێ ڕۆژەی دواییدا، هانیە سەرقاڵی چاوپێکەوتنی قوربانییانی ئازاردان و

سەرکوتکردن و پاکتاوکراوانی ئەتنی و ئاینی بوو، سەردانی گۆڕە بە کۆمەڵەکان و گرتیگەی ئەبوغرێبی کرد و ژوورەکانی لەداردان و ئامێرەکانی ئازاردانی پشکنی، هەروەها سەردانی پزیشکی دادوەری و چەندان نەخۆشخانە و ئۆردووگای پەنابەرانی لە رومادی و بەلەدیاتدا کرد.

چوارشەم (٣٠)ی نیسان:

رۆژی چل و دووەم:

ئێوارەی دوێنێ - یقظان الجادرجي- لە عەمانەوە گەیشت. سەردانی موحسین دزەیی پوورزام لە هوتێلی - برج الحياة-دا کرد، سەرکردایەتیی پارتی دیموکراتی کوردستان لەوێ دابەزیبوون، موحسین دزەیی دوای ٢٥ ساڵ دابڕان سەردانی بەغدا دەکات و زۆر شارەزای ئەو شارەیە، ماوەیەکی زۆر تێیدا ژیاوە و برادەری نێزیکی زۆرن.

پێنجشەم (١)ی مایس:

رۆژی چل و سێیەم:

دەستم بەخوێندنەوەی کتێبی جۆزیف کامبل لەبارەی ئەفسانەوە کرد کە چەند ساڵێک لەمەوبەر نەوزاد پێشکێشی کردبووم.

هەینی (٢)ی مایس:

رۆژی چل و چوارەم

بوش بەکۆتاهاتنی پرۆسە سەربازییەکانی راگەیاند، تەمارا داغستانی لەماڵەوە فراقینی لەگەڵدا خواردین، - یقظان- دوای فراقین هاتە لامان، دوای ٢٠ ساڵ مانەوە لە عەمان ئەمە یەکەم سەردانی بوو بۆ بەغدا، بردمان بۆ یانەی- الصيد- لە مەنسوور - کە ئێستا بارەگەی - المؤتمر الوطني-یە.

شەموو (٣)ی مایس:

کە گەڕامەوە ماڵ فائیزە پێی وتم کە نوها و سوعاد و نیرە و یەقزان چەند دەقەیەک بەر لە ئێستا رۆیشتن، دیاربوو نوها تازە لە بەیرووتەوە هاتبوو و

نامەیەکی لە جالەوە بۆ فائیزە هێنابوو.

بەداخـەوە، لە کـاتی شـەڕدا نوها لە بـەغـدا نەبوو تا شـاکـارێکی وەک ڕۆژانەی بەغـدا لەبارەی شــەڕی کـوێت و مـاوەی ئابڵـووقـە و ژیان لە تاراوگـەی دەرەوەی عێراقدا نـووسـیبـا، ئەو کەشـوهـەوا جوانە و ڕووداوە سـوریالییـانـەی کە وەسـفی کردبوون و ئەو کەسـانەی کە ڕۆڵیـان تێـدا بینیـبوو لەمـانە سـەگـەکەی کـە ناوی سلفـادۆر داڵی بوو، بەواقیعی تۆمـارێکی دەگمـەنی ئێش و ئازاری مـرۆڤی عێـراقی بوون.

یەکشەمە (٤)ی مایس:

ئەحمەد پێی وتین کە لەگەڵ پزیشکان و پزیشکانی ددان مووچەی مانگانەیان کە ٢٠ دۆلار بوو وەرگرت، ئەو پارەیە بەشی بەنزینی ئۆتۆمۆبێلەکەی ناکات.

دەرگـەی قـوتابخـانە و کـۆلێـجـەکـان کـرانەوە، زۆربـەی پۆلەکـان کـورسـیی دانیـشـتنیـان تێـدا نـەمـاوە و تاڵان کـراون، هـەندێک قـوتابخـانـە داوایان کـردووە قوتابیان کورسی لەگەڵ خۆیاندا بێنن.

دووشەمە (٥)ی مایس:

ئەمـڕۆ سـێ ڕۆژنامــەم کـڕی کــە لە بەغـدا دەرچوون، یەکـەم جـارە لـە بەغـدا ڕۆژنامەکان بەیەک نەچن و بیروڕای جیاوازیان تێدابێت کۆمەڵەی پێنجشەمە دوای گـەڕانەوەی نەهـاتووەکـان کـۆبوونەوەی هـەفـتـانـەی سـاز دەدات و بـێ هـیچ کـۆت و مەرجێک دەتوانرێ گفتوگۆ لەسەر هەر بابەتێک بکرێت.

ماوەی ٢٠ سـاڵ دەبوو ئەو کۆمەڵەیە کۆبوونەوەی هەفتانەیان لە ڕۆژی پێنجشـەمە سـاز دەدا هـەر جـارەی بە نۆرە لە مـاڵی ئەندامـێک کۆ دەبوونەوە، سـەرەتای هـەمـوو مـانگێک لیستی بابەتەکان ئامادە دەکرا بۆ گفتوگۆ رادەگەیـەندران ئەو کۆمـەڵەیە برادەرایەتی و بـایەخدانی هاوبەش بـەیەکەوەی کۆ کـردبوونەوە، ئەو بابەتانەی کە گـفـتـوگـۆیان لەسـەر دەکرا فـرە بابەت بوون و هـەرچی بەبیـریاندا هـاتبـا لەمـانە: داسـتـانی گلگامـیش، ڕۆڵی سـیـپـەی دراوی نێـودەوڵەتی لە ڕێژیمی ئابووریی جـیـهـانیـدا، جـیـهـانگەرایی، بـەختـەوەری چییـە؟ هونەری چـەرخی ڕێنیسـانس، داگیرکردنی شار لەلایەن گوندەوە، نەبستراکت لە ڕەسـمدا، نەمری لە ئەفسـانە و

ئەدەبدا، بەدر شاکر ئەلسەیاب، کۆماری ئەفلاتوون، پارێزگاریکردن لە ژینگە، قوتابخانەی باوهاوس لە بیناسازیدا، دوکتۆر عەلی وەردی تایبەتکردن، موزیکی باروک، شۆڕشی پەنجاکان لە شیعر و نیگارکێشی، مەقاماتی عێراقی، هتد.

سەرەتا ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە هەر چوار پێنج کەس بوون و دوایی گەیشتە دە کەس، تا ئێستا سێ کەسیان مردوون، ئەو دە ئەندامە بریتی بوون لە جەبرا ئیبراهیم جەبرا، دوکتۆر خالید قەساب، دوکتۆر نووری مستەفا بەهجەت، قەحتان ئەلەدفەعی، دوکتۆر جەمیل سابیت، حوسێن تەها نەجم، دوکتۆر عەبدولسەلام محەمەد، دوکتۆر وەلید ئەلهاشمی، دوکتۆر عەبدولرەسووڵ کەمالەدین، مەحموود عوسمان.

سێشەم (٦)ی مایس:

لە رووکەشدا جادریە زۆر نەگۆڕاوە، ئەو بێستانانەی کەوتبوونە لێواری نیمچە دوورگەکە "ئەگەر ئەم دەستەواژەیە راست بێت" وەک خۆیانن، دارخورما و پرتەقاڵ لە هەموو شوێن و باخچەیەکدا هەیە، قوللەی زانکۆی بەغدا و دەروازە بەناوبانگەکەی تا ئێستا لە شوێنی خۆیانن، پرتەقاڵ و خورمافرۆش لەسەر شۆستەکان وەک عادەتیان کاری خۆیان دەکەن، لە رێگەکان دانیشتوانی جادریە سڵاو لە یەکتر دەکەن، بەڵام گۆڕانکارییەک هەیە، رێگە بۆ یانەی - الفروسیة- بۆ سەر زێ بۆ ئۆتۆمۆبێل و پیادە کراوەتەوە، هەندێک شوێن کە داخرابوون ئێستا بۆ دانیشتوانی جادریە کراونەتەوە، ژیان بۆ هەندێک بازاڕ و ئەوانەی خواردەمەنیی سەفەری دەفرۆشن گەڕاوەتەوە، گۆڕانێکی تر دەرکەوتنی سەربازە ئەمەریکاییەکانە لە شەقامەکانی جادریە، هەندێک جار قسە لەگەڵ خەڵک دەکەن.

بەهاری ئەمساڵ لە پار باشتر بوو، سپێدەی ئەمڕۆ کە چوومە ناو باخچەکەوە تابلۆیەک لە فرە رەنگی جیا رووبەڕووم بووەوە، کە لە گوڵەکانی کاردۆنیا و ئەکاسیا و مەنۆلیا و رۆز پێکهاتبوو.

جادریە
مایسی ٢٠٠٣

ئابووریی عـێـراق، وەک سـەرچاوەیەکی سـەرەکی بۆ داهات پشـتی بە نەوت بەستابوو، لە ئەنجامی ئەو پشت پێ بەستانە پێداچوونەوە دەورییەکان لە بودجەی گشـتـیی دەوڵەتدا ڕەنگی دایەوە، ئەمـەش لەبەر ڕۆشنـاییی هەڵبـەزین و دابـەزینی نرخـی نەوت لە پـلانەکـانی پەرەپێـداندا، ئەو پشـتـبـەسـتنە بە نەوت و کـەرتە بەرهەمهێنەرەکانی وەک کشتوکاڵ و پیشەسازی فەرامۆش و پەراوێز کرد.

تاکە مـاوەیەک، کە تێیدا هەوڵی ڕژد درابێت بۆ پەرەپێدانی ئەلتەرناتیڤەکان و تەرخـانکردنی واریداتی نەوت لە پرۆژەی کشتوکاڵی و ئاودێری و ژێرخان سـالانی پەنجاکانی سـەدەی رابردوو بوو، لە ٧٥٪ی داهـاتی نەوت لە جیاتیی بچێتە سـەر بودجەی بەکاربردن درا بە ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوە.

لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، بڕیارە سیاسییەکان لەبەر ڕۆشنـاییی ئیعتیبـارە ئابوورییـەکان وەردەگیـرێن، بەداخـەوە لە عێـراقدا و لە سـالانی رابردوودا بڕیارە ئابوورییـەکـان بۆ بڕیارە سـیـاسـیـیـەکـان وەردەگـیـران، بۆ نموونە ئەگـەر بۆ سەرەتایەکان بگەڕێینەوە دەبینین دەوڵەت دوای چەسپاندنی دروشمە سیاسییەکان کەرتی کشتوکاڵیی بەرەو تێکچوون برد، عێراق وردە وردە لە وڵاتێکی تێربوو بووە وڵاتێک کە ٨٠٪ی پێداویستییەکانی دانەوێڵەی لە دەرەوە دەهێنا.

تەوەری سیـاسـەتی ئابووری لە عێراق، پێویستـە ئامانجی ئەوەبێت عـێراق لە کۆمـەڵگەیەکی بەکارهێنەر بکات بە کۆمەڵگەیەکی بـەرهـەمـهێن، کەرتی پیشـەسازی لە نیوەی سـەدەی رابردوو دەسـتی بە دەستپێشخـەرییەکی گرینگ کردووە ئەمـیش بە دامەزراندنی پیشەسازیی خۆجێیی و ناردنی بەرهـەمەکانی بۆ وڵاتانی دراوسێ، ئەوەی کە بووە هۆی سەرخستنی ئەم دەستپێشخـەرییە لەو کاتەدا دەستەبەربوونی بارودۆخی لە بار و بانکە بازرگانییە نێودەوڵەتییەکان بوون کە بە گوێرەی بنەما و پێوەرە نێودەوڵەتییەکان کاریان دەکرد.

ئەو بارودۆخـە ئابوورییە هـاندەرە، لەگـەڵ هـەژموونی دەوڵەت بەسـەر هۆکارەکانی بەرهەمـهـێنان گـۆڕانکاریی بەسـەردا هات، لە شـەسـتـەکـان حکوومـەت کارگـە و

بانکەکان و دامەزراوە تایبەتییەکان لەمانە کۆمەڵە بازرگانییەکانی وەک ئۆرزدی باک خۆماڵی کرد، بەمجۆرە کەرتی تایبەت رۆڵی لە ئابووریی عێراق کەم بووەوە، تاکی عێراقی لە داهێنان و پێشبڕکێ بۆ بەدیهێنانی توانا لە ئابووریی عێراقدا وەستا، لە ماوەی حوکمڕانی رژێمی پێشوودا کەرتی تایبەت پەراوێز خرا، یاسا و بڕیاری وا دەرکران کە دەوری دەوڵەت زیاتر چەسپا و کۆت و پێوەندیش خرایە گەردەنی کەرتی تایبەت.

لە کۆتاییی حەفتاکاندا، یەدەگی نەختینەی بانکی مەڵبەندی عێراق لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت گەیشتە ٤٠ ملیار دۆلار، وەک وڵاتێکی گەورەی خاوەن نەوت عێراق توانی شوێنێکی دیار لە دامەزراوە دارایی و هەرێمی و عەرەبییەکان و سیپەی دراوی بانکی نێودەوڵەتی و سیپەی عەرەبی بۆ پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیپەی دراوی عەرەبی و دەیان دامەزراوی داراییی تر داگیر بکات، بەڵام لەگەڵ بەردەوامبوونی شەڕی عێراق - ئێران، شوێن و پێگەی عێراق لەو دامەزراوە داراییانەدا لاواز بوو بەتایبەتی دوای ئەوەی نەیتوانی ئیلتیزاماتی بەرامبەر ئەوان جێبەجێ بکات، هەندێک لە دامەزراوەکان هەڕەشەی ئەوەیان کرد ئەندامێتیی عێراق هەڵپەسێرن.

عێراق لە دامەزرێنەرانی سیپەی دراوی نێودەوڵەتی بوو، بە حوکمی ئەندامێتی و پشتبەستن بە مادەی چوارەم لە رێککەوتننامە پێویست بوو عێراق ساڵانە پێشوازیی لە شاندی سیپە بکردایە تا گفتوگۆی ساڵانە لەبارەی ئابووریی عێراقەوە ئەنجام بدەن، ئەمەش وەک رێگە خۆشکردنێک تا راپۆرتی ساڵانە پێشکێش بە هەردوو بەڕێوەبەرایەتیی جێبەجێکردن بکەن، هەروەها دەبوایە عێراق ساڵانە زانیاری و سەرژمێریی ئابووری و دارایی و دراوی بدابا بە سیپە، بەڵام ئەم کارانەی نەکرد و مادەی چوارەمی رێککەوتننامەکەی لە کۆتاییی ساڵی ١٩٧٩ پێشێل کرد بە هەنجەتی نهێنیی ئەو زانیارییانە لەبەر رۆشنایی شەڕی عێراق- ئێران.

قەرزە دەرەکییەکانی عێراق وردە وردە کەڵەکە بوون تا لە کۆتاییدا گەیشتنە ١٤٠ ملیار دۆلار، هەروەها بەهۆی چاپکردنی پارە لەلایەن بانکی مەڵبەندی تا کورتهێنانەکانی داپۆشێت نرخی دیناری عێراقی بەرامبەر دۆلاری ئەمەریکایی

گەیشتە ٣٪ بۆ ٣٠٠٠ دینار بەرامبەر هەر دۆلارێک، شەڕێکی ملهوڕانەی تریشی بەدوا داهات و عێراق کوێتی داگیر کرد و سالآنی ئابلّووقە و بێبەشی دەستیان پێ کرد و ئینجا ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ی بەسەردا هات.

لە تشرینی یەکەمی سالّی ٢٠٠٣، ولآتانی پارەبەخش بەپشتبەستن بە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش ژمارە ١٥١١ لە ئیسپانیا کۆنگرەیەکیان ساز دا، لەو کۆنگرەیەدا سەیری ئەو ڕاپۆرتە کرا کە نەتەوە یەکگرتووەکان و سیپەی دراوی نێودەوڵەتی لەبارەی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی عێراق و بنیاتنانەوەی ژێرخانە تەپیوەکەی ئامادەیان کردبوو، لەبەر رۆشنایی ئەو ڕاپۆرتە ولآتە پارەبەخشەکان بڕیاریان دا یارمەتییەک بە بڕی ٣٣ ملیار دۆلار بەشێوەی بەخشین و قەرزی درێژخایەن و کەم سوو بدەن بە عێراق و لە ماوەی نێوان ٢٠٠٤-٢٠٠٧ سەرف بکرێت، ئەمەش بە مەبەستی ئاوەدانکردنەوەی عێراق و پاڵپشتیکردنی پرۆسەی وەرچەرخان و گواستنەوە لە ڕژێمێکی تاکڕەوی تۆتالیتاری خنکێنەر بۆ ئابووریی بازاڕ و بۆ ڕژێمێکی دیموکراسی.

ئەو گۆشەگیرییەی کە ڕژێمی عێراق بۆ زیاتر لە بیست ساڵ بەسەر گەلی عێراقدا سەپاندی وای کرد کە لە پەرەسەندنە فرە بوارەکاندا دووری بخاتەوە، ئەمەش وای لە ولآتە پارەبەخشەکان کرد بەشێکی زۆر لە یارمەتییەکانیان بۆ پەرەپێدان و بنیاتی تواناکان تەرخان بکات، لەلایەکی ترەوە بارودۆخی ئاسایش لە عێراقدا شلّەژا و وای لەو ولآتانە کرد دیسان بەشێکی زۆر لە یارمەتییەکانیان بۆ کاروبار و مەسرووفاتی ئەمنی تەرخان بکەن، جگە لەمەش ڕێژەیەکی زۆر لەو یارمەتییانە بۆ ئەو پڕۆژانە تەرخان کرا کە ولآتە پارەبەخشەکان خۆیان هەڵیان دەبژارد و عێراق هیچ ڕۆڵێکی تێدا نەبوو.

وەرچەرخانی عێراق، لە ڕژێمێکی تاکڕەوی تۆتالیتارییەوە بۆ ئابووریی بازاڕ یەکەم هەنگاوهەڵێنان بوو بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئابووریی جیهانیدا، بەلآم بارودۆخی تایبەتی عێراق وای دەخواست ئەو گواستنەوەیە جۆرێک خۆپارێزیی بوێت و بە قۆناغ کارەکە بکرێت، بۆ نموونە لابردنی باج و رسومی گومرگی پاش سالّی ٢٠٠٣ بازاڕەکانی عێراقی نغرۆ کرد لە کەلوپەلی کارەبایی، لە کاتێکدا عێراق بەدەست کەمیی سووتەمەنی و بەرهەمەکانی نەوت و کارەباوە دەینالآند،

داگیرکردنی بازاڕەکانی عێراق بەو کەلوپەلانە بەرهەمی کشتوکاڵی و پیشەسازیی خۆجێییی لەناوبرد، ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە جۆری ژیانی تاکی عێراقی جگە لە هەرێمی کوردستان هیچ باشییەکی بەخۆوە نەبینی، بەهۆی شڵەژانی بارودۆخی ئەمنییەوە ڕێگریی زۆر لە پەرەپێدان و دەستەبەرکردنی کارگوزارییە بنەڕەتییەکانی وەک کارەبا و ئاو و تەندروستی و پەروەردە و پرۆژەکانی بنیاتنانەوەی ژێرخان کرا.

ئامانجە سەرەکییەکانی ستراتیجیەتی پەرەپێدانی نیشتمانی لە هەردوو ماوەی ٢٠٠٤-٢٠٠٧ و ٢٠٠٧-٢٠١٠ وەک ڕاگەیەندرا ئەم خاڵانە بوون.

١- چاککردنی جۆری ژیان لە عێراقدا.

٢- بەهێزکردنی پێداویستییەکانی بووژانەوەی ئابووری.

٣- چەسپاندن و بەهێزکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی.

٤- پەرەپێدانی کەرتی تایبەت.

لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی کە عێراقیش لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئیمزای کرد جەخت لەسەر ئەو ئامانجانە کراوەتەوە.

پەرەپێدانی کەرتی تایبەت ئامانجی ستراتیجیی دەوڵەتە، بەڵام پەرەپێدانی ئەو کەرتە پرۆسەیەکی فرە لایەن و ئاڵۆزە، کەرتی تایبەت نابووژێتەوە، ئەگەر تا ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆ و ئازاد نەبێت و کەشوهەوای وەبەرهێنان و هاندان و پاڵپشتی و پێویستی حکوومەتی لە قۆناغی یەکەمدا لەگەڵدا نەبێت، ئەو یاسا و بڕیار و ڕێنوێنییانەی کە ڕێژیمی پێشوو بۆ کۆتکردنی ڕۆڵی کەرتی تایبەت تا ئێستا کاری پێ دەکرێت و هیچ هەوڵێک بۆ لابردنی نەدراوە.

ماوەی وەرچەرخان، سەرەڕای ئاستەنگەکان چەند پەرەسەندنێکی ئیجابیی بەخۆوە بینی لەمانە سڕینەوەی ٨٠٪ی قەرزە دەرەکییەکانی عێراق، ئەمەش بووە هۆکاری زیادبوونی ئیراداتی وڵات لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت، سەرەڕای ئەمەش بەرهەمهێنانی نەوت وەک خۆی مایەوە کە ٢,٤ ملیۆن بەرمیلە لە ڕۆژێکدا.

جگە لەمانەش، ئێستا وەرچەرخانێکی لە ڕەگەوە لە دیدی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی عێراق لە ئارادایە، عێراق لە تاکڕەوی خنکێنەر دوور دەکەوێتەوە

ئەمەش بە بنیاتنانی چەمک و بنەمای تازە کە سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگە بەشداریی تێدا دەکەن لە وەرگرتنی بڕیاردا، رۆڵی هەرێمی کوردستان و پارێزگاکان وەک هاوبەشێک لەگەڵ مەڵبەند بۆ رەسمکردنی سیاسەت و پرۆسەی پەرەپێدان بە دیارکەوت، لەو پەرەسەندنە ئیجابییانەی کە شایانی باس بێت، دوای دەرچوونی یاسای وەبەرهێنان و دامەزراندنی دەستەی وەبەرهێنان راستەوخۆ وەبەرهێنانی بیانی هاتە ناو عێراقەوە و بەو هیوایەی وەک چۆن لە زۆر ناوچەی جیهاندا گەشەی کردووە لێرەش ئەوها بووبووژێتەوە.

زیاتر لە چارەگە سەدەیەک، گەلی عێراق لە جیهان دابڕابوو، سەفەرکردن تەنانەت بۆ دەرەوەی سنووریش قەدەغە بوو، ئەو کتێب و گۆوار و رۆژنامانەی لە دەرەوە دەردەچوون لێرە قەدەغە کرابوون، بەکارهێنانی سەتەلایت و مۆبایل هەر قەدەغە بوو، ئەمرۆ هاووڵاتی هەر کاتێک بیەوێت دەتوانێت سەردانی دەرەوەی عێراق بکات و بە ئارەزووی خۆی قسە دەکات و دەنووسێت و بۆ یەکەم جاریش بەشداریی لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئازاددا کردووە، ئەمە یەکەم هەنگاو بوو بۆ بنیاتنانی عێراقی هاوچەرخ و شارستانی نراوە، زاراوەی تازە هاتنە ناو زمانی رۆژانەی عێراقییەکان کە بەردەوام لەسەر زاریانە وەک مافی مرۆڤ، فەرمانڕەوایی، رووبینی، ئەو وشانە هەرچەندە زۆر دەوترێنەوە، بەڵام بەکردار زۆر کاری بۆ نەکراوە.

پرۆسەی گواستنەوە لە عێراقدا، لە واقیعدا جۆرە لەدایکبوونێکی پڕ لە ئێش و ئازار بوو، لە مێژووی ٢٠٠٦/٣/٢٠دا هاووڵاتییەکی عێراقی لە کەنەدا، ئەم نامە ئەلیکترۆنییەی لە برادەرێکی خۆی لە بەغداوە بەدەست گەیشت:

"چەند هەفتەیەک بەسەر ڕاگەیاندنی پلانی ئەمنیی تازە لەلایەنی حکوومەتی عێراقەوە دەرچووە، کە لە بەغدا جێبەجێ دەکرێت، سەرەڕای بانگەشەی ڕاگەیاندن وتاری گەشبین لە تەلەڤزیۆن و ڕۆژنامەکان، بەڵام ژیان لە بەغدا وەکو خۆیەتی و چاک نەبووە، قەدەغەکردنی هاتوچۆ لە سەعات ٨ی ئێوارەوە دەست پێ دەکات و تا ٦ی بەیانی دەخایەنێت جگە لە قەدەغەکردنی هاتوچۆ لە ڕۆژانی هەینی لە سەعات ١١ی بەیانی تا ٣ی پاش نیوەڕۆ، هەندێک جار شەقامەکان سەعاتێک تا دوو سەعات بەر لە وادەی دیاریکراوی قەدەغەکردنی هاتوچۆ چۆڵ دەبن.

قەدەغەکردنی هاتوچۆ نەبووەتە هۆی نەمانی توندوتیژی، بەردەوام ژیانی بەغداییەکان لە مەترسیدایە، ناوچەی ئێمە بۆ نموونە لە چاو هەندێک شوێنی تری هێورترە کەچی بەردەوام بە چەک هەڵدەکوتنە سەر ماڵان و خەڵک دەرفێنن و دەکوژن، بۆ نموونە بەر لە چەند ڕۆژێک، کۆمەڵە چەکدارێکی دەمامکدار هەڵیان کوتایە سەر ماڵی مامۆستایەکی زانکۆ لە نێزیک ماڵی ئێمە، بە قۆنداغە دەمانچە لەسەری خۆی و ژنەکەیان دا و بە بووراوەیی جێیان هێشتن، بەر لەم ڕووداوە بە چەند ڕۆژێک هەر لە ناوچەکەی ئێمەدا ئەندازیارێک و پزیشکێکی ناسراویان ڕفاند.

لەو ڕووداوە دڵتەزێن و ترسناکانەی کە لەم چەند مانگەدا لەگەڵیاندا ژیاین، "شەیما" کە لە ماڵی ئێمە کار دەکات و بووەتە بەشێک لە خانەوادە و زۆر بەڕێزە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەمووان زۆر باشە، جووتە برای لەلایەن چەکدارانەوە بە پاڵنەری تایەفی کوژران و لە ناوچەیەکی کەرخدا لە بەرچاوی خەڵک دڕندانە ئازاریان دان.

جگە لە خراپیی بارودۆخی ئەمنی، بەغداییەکان گیروگرفتێکی ڕاستەقینەی

تریان هەیە، کە نەبوونی کارگوزارییە بنەڕەتییەکانە، کارەبا لە شەو و ڕۆژێکدا ٢ سەعات هەیە، لەبەر نەبوونی کارەبا تۆڕەکانی ئاوەڕۆ پەکیان کەوتووە و هەڕەشە لە چەند ناوچەیەک دەکات و کارەساتی تەندروستی و شوێنەواری بەدواوەیە، لەبەر نەبوونی کارگوزاریی پزیشکی هەر هاوولاتییەکی بەغدایی تووشبوونی بەنەخۆشی شتێکی ئاساییە.

ژمارەی پەنابەرە عێراقییەکان لە وڵاتانی دراوسێ گەیشتووەتە چەند ملیۆنێک و لە بارودۆخێکی ناهەمواردا ژیان بەسەر دەبەن، لە ناوەوەی وڵاتیشدا سەدان هەزار کەس ماڵی خۆیان جێ هشتووە و لە ئۆردووگا و خێوەتاندا ژیان بەسەر دەبەن.

ئەو بەغدایەی کە دەمانناسی لەناو شوورەی کۆنکریتی ناشیریندا ون بووە، بەغداییە ئەسڵەکان شوێنی خۆیان بۆ سەدان هەزار چەکداری هەمەڕەنگ چۆڵ کردووە، شارە جوانەکەیان بووەتە چەند ناوچەیەکی سەربەخۆی وەک کەسک و سوور و ڕەش، عێراقییەکان بوونەتە دوو بەش، عێراقییانی دەرەوە و عێراقییانی ناوەوە، بۆی هەیە ئەمانە هەمووی بەسەر بچن، بەڵام ئەو تۆقینە خنکێنەرەی کە من و هاوسەرەکەم ڕۆژانە دەژین تا "زەینەب"ی کچمان لە دەوام دەگەڕێتەوە زۆر بکوژە و جووڵە و بیرکردنەوە ڕادەگرێت، بەغداییەکان هەموو ڕۆژێک لەگەڵ ئەو تۆقینەدا ژیان بەسەر دەبەن".

دوکتۆر حوسێن سالح، سەرۆکی کۆمەڵەی دەروونناسانی عێراق، لە کۆواری – الحوار- ژمارە (١٦)ی ڕۆژی ١٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨، وتارێکی بە ناونیشانی "چەند دەرسێک لە ٩ی نیسان"دا نووسیوە، ئەمە چەند برگەیەکی وتارەکەیە:

> "ئەوەی کە لە کۆمەڵگەی عێراقی دوای ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ ڕووی دا، گریمانەیەکی دەروونیمان لەبارەی سروشتی بەشەریەتەوە پێشان دەدات کە دەتوانین بەمجۆرە دایبرێژین:
>
> کە دەوڵەت ڕووخا و یاسا پەکی کەوت و ژیان بووە فەوزا ئەوا ترس لە نێوان خەڵک بڵاو دەبێتەوە و کانتۆنات دروست دەبێت یان تاک تاکە کار دەکەن و لە هەڵسوکەوتیاندا پێویستییان بە مانەوەیە، ئەو کاتەش

پەنا بۆ سەرچاوەی هێز یان کۆمەڵێک دەبەن تا بیانپارێزێت و لە نێوانیاندا جۆرە گرێبەستێک دروست دەبێت و لەسەر بنەمای پاراستنی بەرامبەرە.

ئەو وەرچەرخانە سایکۆلۆجییە سەرەتاییەی کە عێراقییەکان بینییان و دوای ئەو شادییەی کە زۆربەیان لە ئەنجامی نەمانی دیکتاتۆریەت هەستیان پێ کرد شتێک بوو زیاتر لە خەیاڵ دەچوو، عێراقییەکان رۆژی ٩ی نیسان لە خەو هەستان و بینییان ئەو مۆتەکەیەی کە چارەگە سەدەیەک خنخنۆکی گرتبوون نەما، شادیی عێراقییەکان تێکەڵاو بوو بە سەرسامی، ئەوەی رووی دا بە زەحمەت بڕوا دەکرا، بۆ یەکەم جار لە مێژوویاندا عێراقییەکان دڵیان بەوە خۆش بوو ئەو فەرمانڕەوا زۆردارەی کە وڵاتەکەی وێران کردن و لە شەڕی ملهوڕانەدا رۆڵەکانیانی بە کوشت دا و لە گرتیگە تاریکەکان و شەقامەکاندا بە نوێژی نیوەڕۆ مرۆڤی لەناودەبرد، بەڵێ ئەو فەرمانڕەوا دڕندەیە نەما.

ئەو خۆشی و شادییە تەنیا چەند رۆژێکی خایاند، عێراقییەکان ئەو کاتە نەیاندەزانی ئەوەی رووخا رژێمی سەدام حوسێن نەبوو، بگرە تەواو دەوڵەت رووخا، رەشماڵی دەوڵەت کە رووخا هیچ رەشماڵێکی تر خەڵکی نیشتمان بەیەکەوە کۆ ناکاتەوە، خەڵک تووشی شڵەژان دەبن و پێویستییان بەمانەوە هەیە، بۆیە هەن پەنا بۆ عەشیرەت یان مەرجەعی ئاینی یاخۆ گردبوونەوەی مەدەنی و پێکهاتەی سیاسی و هی تر دەبەن، ئەوەی کە هەستی ترسی لە نێوان خەڵکدا زیاد کردووە و بەسەر مەرجەعیاتی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی و ئاینی دابەشی کردوون لە ژمارە نایەن، سیمای شادی بەنەمانی دیکتاتۆریەت لەگەڵ هەستکردن بە ئازار و مەینەتی تێکەڵاوبوون، بەغدا تاڵان و بڕۆ کرا، دامەزراوەکانی دەوڵەتی سووتێندران و ژمارەیان گەیشتە بیست دامەزراو و لە مێژوویاندا کارەساتی وا نەبووە، ئەو کارەساتە ئەوەندە شێتانە پەلی هاویشت کار گەیشتە ئەو رادەیەی وڵات لەلایەن خەڵکەکەیەوە تاڵان بکرێت".

## كيف يصف

# جلالة المغفور له الملك فيصل

## المرحوم ملا افندي

وردتنا كلمة نقتطفها من جريدة العراق الغراء :

لم اجد كلاما يعبر عن سجايا ومزايا المرحوم ملا افندي ابلغ مما قاله عنه جلالة المغفور له الملك فيصل الاول وذلك: قد قصد يوما سماحة المرحوم رفيق افندي خادم السجادة النبوية نائب كركوك سابقا ، وسعادة المرحوم عبد الله مخلص بك نائب اربيل سابقا معا زيارة المغفور له جلالة الملك فيصل الاول قبل بضعة عشر عاما . وبعد تشرفهما بالمثول بين يديه ، سأل جلالته منهما عن صحة واحوال ملا افندي وذلك نظراً لعلم جلالته بصلة المرحومين القوية بهما . وكان جلالة المغفور له الملك علي حاضراً عنده آنئذ ، ثم وجه جلالته خطابه الى جلالة شقيقه ويقول :

اتتكلم تر ملا افندي؟ ليتك قد رأيته (فانه ليس له مثيل في الشمال بل في العراق ولا بل في الآفاق) بهذا الوصف البالغ وصف جلالته المرحوم ملا افندي لشقيقه . واني شخصيا سمعت باذني هذه القصة من المرحومين مخلص بك ورفيق افندي بعد عودتهما من التشرف بزيارة الملك الراحل العظيم . فعليه اختم كلامي هنا واكتفي بذكر هذا الوصف الملكي البليغ المنبعث ملا افندي دون علاوة كلام آخر عليه لأن كلام الملوك ، ملوك الكلام!.. تغمدهم الرحمن برحمته الواسعة جميعا .

«شمالي»

---

قاسم ملا افندي — اربيل

بنهايي تأثر ايله خبري وفات ملا افندي وار كرد جدا زيادة بهمو سنى يك لوه اشتراك تعزيتا اكم ايره خوشبو

كولونيل لاين

رۆژنامەی "العراق"، ١٩٤٣ز

# رسائل وبرقيات العظماء

وما ان شاع خبر الفاجعة في البلاد حتى انهالت مئات من برقيات ورسائل التعازي من جميع الجهات على سعادة الوجيه المفضال والسري الاصيل السيد قاسم آغا ملا افندي [illegible] حيث ان [illegible] الجليل السيد [illegible] النجل الاكبر كان خارج العراق وفي مقدمة المواسين المعزين سعادة وكيل رئيس التشريفات الملكية باسم سيدنا صاحب السمو الملكي الوصي المعظم، وفخامة الرئيس والزعيم الوطني المحبوب الجليل السيد نوري السعيد، وفخامة المستر كنهان كورنواليس السفير البريطاني في العراق وفيما يلي نصوص بعض البرقيات مع الاجابات عليها:

صورة برقية سيدنا الوصي

السيد قاسم — اربيل

أمرني مولاي حضرة صاحب السمو الوصي المعظم بأن ابلغكم مزيد حزنه وعطفه الكريم بوفاة المرحوم ولدكم ملا افندي.

وكيل رئيس التشريفات الملكية

( الجواب )

سعادة وكيل رئيس التشريفات الملكية — بغداد

نرجو ان ترفعوا لاعتاب مولانا صاحب السمو الوصي المعظم شكرانا للتعزية وامتناننا العميق لما تفضل به من المواساة السامية التي كانت لنا خير عزاء وسلوى في فجيعتنا الاليمة ادام الله بقاء سموه ذخراً للبلاد [illegible] وحفظ صاحب الجلالة الملك المعظم بعين عنايته.

قاسم

صورة برقية فخامة الرئيس الجليل

السيد قاسم ملا افندي — اربيل

فجعنا بفقد ولدكم العزيز [illegible] نشاطركم الحزن العميق، ونسأل الله ان يلهمنا واياكم الصبر الجميل.

نوري السعيد

( الجواب )

صاحب الفخامة رئيس الوزراء الافخم — بغداد

نرفع آيات الشكر والامتنان لفخامتكم لما تفضلتم به من المواساة الكريمة في فجيعتنا الاليمة والتي كان وقعها عظيماً في نفوسنا المحزونة نسأل الله ان يحفظكم بعين عنايته ويمدكم بعونه وتوفيقه.

قاسم

كتاب فخامة المستر كنهان كورنواليس السفير البريطاني في العراق

السفارة البريطانية — بغداد ٢ كانون الثاني ١٩٤٣

ڕۆژنامەی "فتى العراق"، ١٩٤٣ز

## مادبتـان تكريميتـان

اقام الاستاذ المحامي زيد احمد عثمان ظهر امس بداره في الهندية مادبة غداء تكريما للسيد ادريس البارزاني نجل الملا مصطفى البارزاني بمناسبة قدومه والوفد المرافق له الى بغداد ومقابلتهم للسيد رئيس الجمهورية الفريق عبدالرحمن محمد عارف وكان الاستاذ زيد واخوانه يستقبلون ضيوفهم بما جبلوا عليه من لطف ويسبغون عليهم ضروب الحفاوة والتكريم . وقد انتظمت دارة الاستاذ زيد عددا كبيرا من الشخصيات المعروفة باشتغالها بالحقل الوطني والقضايا العامة كان منهم السادة : ادريس البارزاني وحبيب محمد كريم ومحسن ديزه يي ونافذ جلال وصالح اليوسفي وشوكت عقراوي والاستاذ عبد الرحمن البزاز رئيس الوزراء السابق وبابا علي وفؤاد عارف وعلي السنجري والدكتور عبد الرحمن عبدالله ورشيد نجيب ؛ وعلي كمال ورؤوف احمد واحسان شيرزاد وفرني الدوغره مجي وهادي الجاوشلي واكرم الجاف ومسعود محمد واحمد كمال وكريم مراد وجبار عزيز ومهدي السيد محسن الحكيم وعلي الشملان وعمر علي وحسين جميل وصادق كمونة والدكتور كاظم شبر وكاظم الرواف والدكتور باقر عبد الغني وعبد الوهاب الامين وخليل جميل والحاج نعمان العاني ، وقد انتهت حفلة الغداء بعد الساعة الثالثة ،وكانت فرصة طيبة اتاح بها الاستاذ زيد احمد عثمان لهذه النخبة التحدث في مختلف القضايا القومية والوطنية ومواضيع الساعة ، وقد ترك الضيوف دار صاحب الدعوة مودعين بمثل ما استقبلوا به من التكريم .

وفي مساء اليوم ذاته اقام الاستاذ فؤاد عارف بداره في شارع المغرب مادبة عشاء تكريمية على شرف السيد ادريس البارزاني حضرها اكثرية الشخصيات التي تناولت الغداء على مائدة السيد زيد احمد عثمان بالاضافة الى عدد اخر من الشخصيات العربية والكردية وكان « ابو فرهاد » على سجيته يبالغ في اكرام ضيوفه ويحفهم باللطف والاريحية المأثورة عنه ، وفي ساعة متاخرة من الليل خرج ضيوف الاستاذ فؤاد عارف بعد تناول العشاء على مائدته شاكرين له ما لقوه في داره من حفاوة بالغة وتكريم .

ڕۆژنامەی "العرب" شەموو ١٩٦٧/١/٢١ز

# بۆ (فیصل)

پیرەمێرد ئەم هەڵبەستەی بۆ (فیصل)ی کوڕی ئەحمەد ئەفەندی هەولێری ووتووە کە لە ٦ی مارتی ساڵی ١٩٤٣ دا لە هەولێر خۆی کوشتووە یا کوژراوە.

هەورێکی سوور ، لە کاولی وەتەن ، کەوتە گڕو هوور
دایپۆشت بە شینو گریەوە ، فرمێسکی خوێنی سوور
وابزانی پشکووتنی گوڵاڵەی بەهارییە
گوڵی نەورۆزە ، بەرگی سووری کوردەوارییە
هەیڕۆ ! تومەز گوڵاڵە نەبوو ، خوێنی لاوێک بوو
هەڵکەوتوویەک بوو بۆ هەموو کورد نووری چاوێک بوو
لەم کاتەدا کە گوڵ لە هەموو لاوە دەپشکوێ
کوێربی فەلەک لە تازەگوڵی ئێمە چیت ئەوێ ؟!
چرایەک بوو بۆ نیشتمان ، خۆی بەو هیوایەوە
ئەیویست ڕووناکی بنوێنێ ، ئاخ زوو کوژایەوە !
توخوا کوڕینە سا بگرین شینی فیصلە
ئەو خوێنەی وا ڕژاوە هیوای کوردی تێکەڵە(١)
کۆمەڵ لەزایە ، ماتەمە ، شینە لە ناو گەلا
تاریخییە : فیصلە چووە بۆ خزمەتی مەلا(٢)

---

(١) لەکاتی خۆیدا ساغ نەبووەوە کە فیصل خۆی کوشتووە یاخود کوژراوە .

(٢) مەلا نیازی لە مەلا ئەفەندی هەولێرە . بە حسابی ابجد مصرعی دووەمی دوا دێڕ ئەکاتە ١٣٦٥ ی هجری .

لەسەر بڵندترین دوندی چیای حەسارۆست کە چیا و دەشتایی و تاشەبەرد دەوریان داوە و مێژوویان بۆ بەر لە دروستبوونی گەردوون دەگەڕێتەوە و بەرامبەر ئەو مەزنیە مرۆڤ بچووک و هیچ لەبارا نەبووە، بەڵێ لەوێ گونجاوە ئەگەر بە دوای لێکدانەوەیەکدا بگەڕێین.

حوزەیرانی ٢٠٠٩

## پێرست



- بایەخ پێدانەکانی دانەری ئەم کتێبە هەمەجۆر و هەمەلق و پۆپە، جگە لەوەی کە شارەزای بواری داراییە، بەڵام بایەخێکی سەرەکی بە ئەدەب و رۆشنبیری و هونەر دەدا.
- لە زانکۆی -کامبدج-ی بەریتانیا خوێندوویەتی، لە کۆمپانیای نەوتی عێراق و پاشان لە وەزارەتی دارایی کاری کردووە، لە کاتی کارکردنی لەو وەزارەتەدا ئەندامی چەندان ئەنجوومەنی کارگێری و پارێزگاری چەندان دامەزراو و دەستەی دارایی نیشتمانی و عەرەبی و نێودەوڵەتی بووە وەك دەستەی عەرەبی بۆ بووژاندنەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە کوێت، بانکی عەرەبی بۆ پەرەپێدانی ئابووری لە ئەفریقیا - خەرتووم، سندووقی ئۆپێك بۆ پەرەپێدانی نێودەوڵەتی لە ڤیەننا کە تێیدا چەند ساڵێك بە نۆرە پارێزگاری سندووقەکە بووە.
- ساڵی ١٩٩٥ وازی لە وەزیفەی میری هێناوە و لە کەرتی تایبەتی کاری کردووە لەمانە: سەرۆکی ئەنجوومەنی کارگێڕیی کۆمپانیای وەبەرهێنانی دارایی بۆ ماوەی ٥ ساڵ، هەروەها دامەزرێنەر و ئەندامی کارگێڕیی یەك لە بانکە بازرگانییەکان و کۆمپانیایەکی تایبەتی بۆ دڵنیایی بووە.
- دوای نیسانی ٢٠٠٣ وەك ئەندامی چەندان دەستە و لیژنەی ئابووری و دارایی هەڵبژێردراوە وەك دەستەی ستراتیجیی بنیاتنانەوەی عێراق، دەستەی راوێژکاری ئاست بەرزی بەرنامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ نشینگە مرۆییەکان لە عێراق.
- لە ماوەی وەرچەرخانە رۆشنبیرییەکاندا ژیاوە، شایەدی بزاڤە نوێخوازییەکانی شیعر و هونەری شێوەکارییە لە عێراقدا لە چلەکان و پەنجاکان هاوچەرخی رەمزە دیارەکانیان بووە، هەروەها شایەدی بزاڤە رۆشنبیرییەکانی ساڵانی شەستەکانە و وەك نووسەر و رەخنەگر چەندان وتاری لە بواری رۆشنبیری و هونەردا بڵاو کردووەتەوە.
- لە شەوەزەنگەکانی هەشتاکان و نەوەتەکان و لە سێ شەڕی کاولکەردا بەغدای جێ نەهێشتووە، هەروەها لە ساڵانی تۆقاندن و لێك ترازانی پاش ٢٠٠٣ هەر لەو شارەدا ماوەتەوە.
- شەوەزەنگەکانی بەغدا و رۆژانی چراخان و ئومێدیشی بینیوە.


چاپخانەی

هەولێر - کوردستان

Aras Press

Kurdistan - Erbil


بایی ٤٠٠٠ دینارە